بەماکانی ڕێزو ڕەوشت

# چیرۆکە پەروەردەییەکان

13
چیرۆکی کاریگەر

وەرگێڕانی
مامۆستا دیار ئەسعەد








# چیرۆکە پەروەردەییەکان

## بنەماکانی ڕێز و ڕەوشت

### ١٣ چیرۆکی کاریگەر و بەسود




07701918565 - 07501571818

چاپ و بڵاوکردنەوە

**ناوی کتێب:** چیرۆکە پەروەردەییەکان

**وەرگێڕانی:** مامۆستا دیار ئەسعەد

**نۆبەتی چاپ:** چاپی سێهەم

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گتییەکان ژمارەی سپاردنی (١١٦٧) پێدراوە



# بەسەرهاتی شاژنی بەفر (فرۆزین)

کاتێک شازادە ئانا و شازادە ئیلسای ئێرن دێڵ منداڵ بوون، هاورێیەکی زۆر خۆشەویستی یەکتر بوون هەمیشە پێکەوە یاریان دەکرد، ئانا تاکە کەس کە نهێنیە سحراویەکەی ئیلسای دەزانی، ئیلسا خاوەنی ئەو هێزە سحراویە بوو کە دەیتوانی بەفر بە دەستەکانی دروست بکات! شەوێکیان ئیلسا ژوورێکی سەمای بەتاڵی پر پر کرد لە بەفر پێکەوە ئەو دوو خوشکە (ئانا و ئیلسا) کاتێکی زۆر زۆر خۆشیان پێکەوە بردە سەر بووکە بەفرینەی جوانیان درووست کرد،خلیسکێنەی سەر هۆڵیان کرد. بەڵام لەو کاتەی کە یارییان دەکرد ئیلسا کۆنترۆڵی خۆی لە دەست دا، بە رووداو بەبێ ئەوەی ویستی بێت هەوایەکی توندی بەفر لە دەستەکانی دەرچوو بەر ئانا کەوت و ئانای خوشکی بە توندی ئازاری پێکەیشت، هەربۆیە دایک و باوکی ئانا، ئانای کچیان برد بۆ لای دێوەکەی چیا دێرینەکەبۆ ئەوەی ئانای کچیان چاک بکاتەوە، لەوێ دێوە پیرە ژیرەکە پێی وتن کە دەتوانێ ئانا چاک بکاتەوە، ئانا بە بەخت بوو کە ئازارەکە بەر سەری کەوتووە نەک دڵی!! هەرچەندە ئانا تەندروستی بەرەو باشتر دەچوو



بەڵام دایک و باوکی ئیلسا نیگەران بوون لەوەی کە خەڵکی ئێرن دێڵ بە نهێنیە سحراویەکەی ئیلسا بزانن لێی بترسن، هەر بۆیە هەستا بە دروست کردنی دیوار بە دەوری قەڵاکەدا بۆ ئەوەی کەس نەتوانی بێت ناو قەڵاکە. بەڵام لەبەرئەوەی ئیلسا هەستێکی بەهێزی هەبوو نەیدەویست ئانای خوشکی ئازار بدات بۆیە بڕیاریدا کە جارێکی تر یاری لەگەڵ نەکاتەوە، ئەمەش وای کرد ئانا هەست بە تەنیایی بکات، هەرچەندە دایک و باوکی ئانا لە زریانەکەدا تیاچون ئەو دوو خوشکە بچوکە هیچ کاتێکیان پێکەوە نەبردە سەر. ساڵانێک دواتر کاتی ئەوە هات کە ئیلسا ببێت بە شاژنی ئێرن دێڵ، هەر لە هەمات رۆژدا هەموو دەروازەکانی قەڵاکە کرانەوە سەدان کەس ئامادەی مەراسیمی تاج لەسەر نانەکەی شازادە بوون، ئیلسا زۆر هەوڵی ئەوەی دەدا نهێنیە سحراویەکەی بشارێتەوە،ئانا زۆر دڵخۆش بوو بەوەی کە خەڵکانێکی نوێ دەبینێ. لە ئاهەنگەکەدا ئانا سەمای لەگەڵ شازادەیەکی زۆر جواندا کرد کە ناوی شازادە هانس بوو لە دوورگەیەکی باشورەوە هاتبوو، شازادە جوانەکە دڵی ئانا ی خستە لەرزین و بەلای خۆیدا بردی، بەڵام لەبەر ئەوەی دەروازەکانی قەڵاکە تەنها بۆ یەک رۆژ دەکرانەوە، هانس و ئانا زانیان کە ئەمە دوا دەرفەتیان دەبێت بۆ ئەوەی یەکتری ببینن، ئەتوانم شتێکی شێتانەت پێبڵێم؟ ئەتوانی هاوسەرگیریم لەگەڵ بکەیت؟ هانس ئەمەی بە ئانای ووت، ئاناش رازی بوو و ووتی: بەڵێ، ئانا و هانس داوای رەزامەندیان لە ئیلسا کرد سەبارەت بە هاوسەرگیریەکەیان، بەڵام ئیلسا وای هەست دەکرد کە هاوسەرگیریەکەیان بیرۆکەیەکی باش



نەبێت و وتی: تۆ ناتوانی هاوسەرگیری لەگەڵ کەسێک بکەیت کە هەر ئێستا بینیوتە و باش نایناسیت، بۆیە من رازی نیم لەسەر هاوسەرگیریتان، ئانا نەیتوانی بروا بە وەڵامەکەی ئێلسا بکات و ووتی: بۆ دەتەوێت رێگریم لێبکەیت؟ لە چی دەترسیت؟ ئێلسا جارێکی تر کۆنترۆلی لە دەست دا و هاواری کرد ووتی: بەسە!، هەرکە هاواری کرد بەفر لە دەستیەکانیەوە دەهاتە دەرێ هەموو ئامادەبوانی ئاهەنگەکەو خەڵکی ئێرن دێڵ بە نهێنیە سحراویەکەی ئێلسا یان زانی، هەربۆیە ئێلسا زۆر ترساو بەرەو چیاکان هەڵهات. ئانا هەستی بە ترسێکی زۆر کرد، لەدەستدانی کۆنترۆڵی ئێلسا بووە هۆی دروست بوونی زریانێکی ترسناکی زستانە لە کاتێکدا لە ناوەراستی هاویندا بوون!، من ئەرۆم و ئەیهێنمەوە، ئانا ئەمەی ووت و هانس ی کرد بە بەرپرسی پاشایەتیەکەو بەسواری ئەسپ بە خێراییەکی زۆر بە دوای ئێلسادا رۆشت، بەڵام هەرکە ئانا ئەسپەکەی بەناو زریانە تورەکەدا تاودا ئەسپەکە ئانای فرێدایە ناو بەفرەکەو گەڕایەوە بەرەو ئێرن دێڵ. خۆشبەختانە ئانا ئاسک و گالیسکەیەکی سەر بەفری بینی پیاوێک بەسەر گالیسکەکەوە بوو ناوی کریستۆف بوو ئاسکەکەشی ناوی سڤین بوو، ئانا داوای هاوکاری لە پیاوەکە کرد، پیاوەکە ووتی: من دەزانم ئەم زستانە چۆن کۆتایی پێدێنم، پیکەوە دەستیان کرد بە گەڕان بە دوای ئێلسا دا، لەو کاتەی کە ئانا و کریستۆف بەسەر شاخەکەدا سەرکەوتن باڵە خانەیەکی بەفری خەیاڵی جوانیان بەرچاو کەوت، لەوێ بووکە بەفرینەکی سەرنج راکێشیان بینی ناوی ئۆلف بوو، ئانا تەماشای کرد و بیری کردەوە کە پێشتر



بینیویەتی پێی ووت: ئۆلف ئیلسا دروستی کردویت؟ ئۆلف بزەیەکی کرد و ووتی: بەڵێ، بۆچی؟ ئایا ئەزانی ئیلسا لە کوێیە؟ بەڵێ، بۆچی؟ کریستۆف ووتی: ئەمانەوێت بەهار بگەڕێنینەوە، ئۆلف زۆر پەرۆش بوو بۆ ئەوەی یارمەتیان بدات و ووتی: بابڕۆین، لە هەمانکاتدا هانس بەدڵسۆزیەوە لە هەوڵی یارمەتیدانی خەڵکی ئێرن دێڵ بوو بەڵام کە بینی ئەسپەکە بەبێ ئانا گەرایەوە بۆ قەڵاکە زانی کە ئانا لە مەترسیدایە، روی کردە خەڵکەکە ووتی: شازادە ئانا لە مەترسیدایە پێویستم بە کەسانی خۆبەخشە بێت لەگەڵم بۆ ئەوەی شازادە ئانا بدۆزینەوە، یەکسەر هانس و چەند سەربازێک دەستیان کرد بە گەڕان بە دوای ئانا و ئیلسا دا، با بگەڕێینەوە بۆ چیاکە، لەوێ ئۆلف ئانا و کریستۆفی برد بۆ لای کۆشکێکی زۆر گەورەی لە بەفر درووست کراو کە ئیلسا بە هێزە سحراویەکەی درووستی کردبوو، تەنانەت کریستۆفیش سەری سورما لە بینیی ئەو کۆشکە بەفرینە. لە ناو کۆشکەکەدا ئانا باسی ئەو زریانە بە هێزەی بۆ ئیلسا کرد کە ئێرن دێڵ درووستی کردووە پێی ووت کە تەنیا تۆ دەتوانی ئەو بەفرە بتوێنیتەوە، ئیلسا دوای بیستنی رروداوەکە نیگەران دەردەکەوت و ووتی: نازانم چۆن!. ئیلسا لەوە دەترس ئەگەر بگەڕێتەوە ئەوا ڕەنگە زریانەکە خراپتر و بە هێزتر بکات، بارودۆخی ئێرن دێڵ و ئانا باشتر بێت کە ئیلسای لێ نەبێت، ئانا بەردەوام بوو لە هەوڵدان بۆ ئەوەی ئیلسا بگەڕێنێتەوە بۆ ئێرن دێڵ، بەڵام ئیلسا دەترسا لەوەی کە ئەگەر بگەڕێتەوە ڕەنگە کەسی تر ئازار بدات، لەو کاتەی ئانا لە هەوڵی رازی کردنی



ئیلسادا بوو شەپۆلێکی توندی بەفر لە دەستەکانی ئیلسا دەرچوو و بەر سنگی ئانا کەوت،ئیلسا هاواری کرد و ووتی: ئانا! ئانا هەستایە سەرپێ و سەیری ئیلسا ی کردو ووتی: من بەبێ تۆ ئێرە بەجێناهێڵم، بەڵام ئیلسا سور بوو لەسەر ئەوەی کە نەگەرێتەوە بۆ ئێرن دێڵ، هەر بۆیە سحرەکەی بەکارهێنا بۆ درووستکردنی بووکە بەفرینەیەکی زۆر گەورە بۆ ئەوەی هاورێکانی لە کۆشکەکە بکاتە دەرەوە و بە بووکە بەفرینەکە راوی نان بەرەو کەندەڵانەکە، کریسۆف گوریسێکی لە گالیسکەکە دەرهێنا بۆ ئەوەی یارمەتی دەر بێت بتوانن پێی بچنە خوارەوە لە کەندەڵانەکە، چی روودەدات ئەگەر بکەوینە خوارەوە؟ ئانا لە کریستۆفی پرسی، کریسۆف وەڵامی دایەو ووتی: بیست پێ خۆلی لێیە ئەگەر بکەویتە خوارەوە وەکو ئەوە وایە بکەویتە سەر پشتیەکی نەرم، هەربۆیە لە قەراغی کەندەڵانەکەوە بازیاندا و بە سەلامەتی گەیشتنە خوارەوە بی ئەوەی ئازاریان پێبگات پێویست بوو وا بکەن بۆ ئەوەی لە دەست بووکە بەفرینە زەبەلاحەکە رزگاریان بێت، بەڵام ئانا شتێکی تر هەبوو کە پێویست بوو نیگەران بێت لێی! قژی ئانا بەرە بەر رەنگەکەی بەرەو رەنگی سپی بەفری دەگۆرا، ئەمە بە هۆی ئەوەیە کە ئیلسا بە هێزە سحراویەکەی ئانا یدا کێشاوە، دێوەکە ئەمەی ووت کاتێک کریسۆف ئانا ی بۆ چارەسەر برد بۆ لای، یەکێک لە دێوەکان ووتی: سحرەکەی ئیلسا بەر دڵی ئانا کەوتووە ئەگەر ئەو سحرە نەگەریندرێتەوە ئەوا لە نزیکترین کاتدا جەستەی ئانا دەگۆرێت بۆ بەفرێکی رەقی بەستوو، وە تەنیا خۆشەویستیەکی راستەقینە دەتوانێت دڵێکی بەستوو



بتوێنێتەوە! ئانا زانی کە هانس خۆشی دەوێت ماچێکی ئەو ڕنگە کاری خۆی بکات و دڵە بەستوەکەی خاو بکاتەوە چونکە بەراستی خۆشی دەوێت هەربۆیە ئانا و هاورێکانی بە خێرایی بەرەوە ئێرن دێڵ گەڕانەوە، ئانا بەرە بەرە جەستەی دەستی بە لەرزین کرد، کریستۆف بەتایبەت زۆر نیگەرانی بارودۆخی ئانا دەیویست بەهەر شێوەیەک بێت یارمەتی بدات زۆر لە خەمی ئەودا بوو، لەو کاتەدا هانس و سەربازەکان گەیشتنە کۆشکە بەفرینەکەی ئیلسا و پەلاماری ئیلسایان دا، ئیلسا بۆ ئەوەی بەرگری لە خۆی بکات بە بەفرە نوک تیژەکان یەکێک لە سەربازەکانی دوورخستەوە، هانس هاواری کرد و ووتی: شازادە ئیلسا مەبە بە کەسێکی دڕندە و ترسێنەر تۆ کەسێکی وا نیت، ئیلسا وەستا بەڵام بە دوو دڵیەوە سەربازەکان کێشایان بە ئیلسادا و بورایەوە و ئیلسایا بردەوە بۆ کۆشک لە ژێرزەمینێکدا زیندانیان کرد، کاتیک ئانا گەیشتەوە ئێرن دێڵ ماڵئاوایی لە کریستۆف و ئۆلف کرد و پەلەی کرد بۆ بینینی هانس، هەرکە ئانا و هانس بە تەنیا مانەوە ئانا داوای لە هانس کرد ژیانی بپارێزێت بە تەنیا ماچێک، بەڵام هانس ئەوەی ڕەتکردەوە، ئانا ئەوەی بۆ دەرکەوت کە هانس تەنیا خۆی وا دەرخستوە کە ئانا ی خۆش ئەوێت بەڵام لە ڕاستیدا خۆشی نەویستوە، ئەو ویستویەتی دەست بگرێت بەسەر ئێرن دێڵ ئەویش بە لە ناوبردنی ئانا و ئیلسا. ئەوەی کە ماوەتەوە کە ئیلسا بکوژم و هاوین بگەڕێنمەوە، هانس ئەوەی وت و بەبێ ئەوەی ماچی ئانا بکات بەجێی هێشت. هانس ئانای بە تەنیا بەجێ هێشت و جەستەی ئانا بەرە بەرە دەیبەست و دەلەرزی،



خۆشبەختانە ئۆلف ئانا ی دۆزیەوە و ئاگرێکی بۆ کردەوە بۆ ئەوەی گەرم بێتەوە بەڵام ئانا تا دەهات بێهێزتر و لاوازتر دەبوو، ئانا پیلانە دوژمنکارانەکەی هانس ی بۆ ئۆلف باس کرد، ئۆلف لە پەنجەرەکەوە سەیری دەکرد لە ناکاو بینی کریستۆف بە خێرایی بەرەو قەڵاکە دێت، ئۆلف درکی بەوە کرد کە کریستۆف ئانا ی خۆش دەوێت و ووتی: ئانا ئەوە خۆشەویستە راستەقینەکەت لێرەیە، ئانا بینی کریستۆفە و پێویستی بە ماچێکە بۆ ئەوەی جەستە و دڵی نەیبەستێ بە هەموو ئەو هێزەی کە لە جەستەیدا مابوو رایکردە دەرەوە، لە هەمانکاتدا ئیلسا توانی لە زیندانەکە خۆی رزگاربکات بەلام هانس لە پشتەوە زۆر نزیک بوو لە ئیلسا، بە ئیلسای وت: ئیلسا ناتوانی لە دەستم رابکەیت ویستم ژیانی ئانا رزگاربکەم بەڵام کات زۆر درەنگ بوو، ئیلسا هەستی بە تاوان دەکرد کە هەموو شتێکی کرد تا ئانای خوشکی بپارێزێت بەڵام نەیتوانی، هەر لە نزیکانە ئانا زۆر بە پەلە بەرەو رووی کریستۆف دەرۆیشت کاتێک گوێی لە دەنگی شمشێرەکەی هانس بوو بینی کە ژیانی ئیلسا لە مەترسیدایە، ئانا لە جیاتی ژیانی خۆی ڕزگار بکات و بەرەو رووی کریستۆف رابکات خۆی فرێدایە بەردەم شمشێرەکەی هانس، هەرکە هانس شمشێرەکە دا هێنا بەرووی ئیلسادا ئانا خۆی خستە بەردەم شمشێرەکە و جەستەی ئانا بوو بە پارچە بەفرێکی بەستوو و شمشێرەکەی هانس پارچە پارچە بوو، ئیلسا ئانای خوشکی گرت و ووتی: نا ئانا تکایە نا!، کتوپڕ جەستەی ئانا توایەوە قۆڵەکانی

جارێکی تر گەرم بوونەوە کاتێک بەر لەشی ئیلسای خوشکی کەوت، دوو خوشکەکە جارێکی تر باوەشیان کردەوە بە یەکدا . لەو کاتەی ئۆلف تەماشای دەکردن قسەی دێوە پیرە ژیرەکەی وەبیر هاتەوە کە ووتی خۆشەویستی ڕاستە قینە دڵ دەتوێنێتەوە.خۆشەویستی ئانا بۆ خوشکەکەی هەردووکیان و پاشایەتیەکەشی پاراست، جارێکی تر دوو خوشکەکە بوونەوە بە دوو هاوڕێی زۆر نزیکی یەکتر و هاوین جارێکی تر گەرایەوە بۆ ئێرن بێڵ، ئیلسا پارچە هەورێکی بچوکی بۆ ئۆلف دروست کرد بۆ ئەوەی بیپارێزێ و نەتوێتەوە،ڕۆژێکیان ئیلیسا سوپرازێکی هەبوو بۆ ئانا ئەویش ئەوە بوو کە دەروازەکانی قەڵاکە بۆ هەمیشە کراوە دەبێت جارێکی تر دایناخەین و لە یەکتری دوور ناکەوینەوە، دوو خوشکەکە بزەیەکیان بۆ یەکتری کرد و ئێستا هەموو شتەکان بەو شێوەیە کە پێویست بوو وابێت.





# بەسەرهاتی پەری دەریا بچووکەکە

سەردەمانێک پێش ئێستا لە شوێنێکی دوور، پاشای پەری دەریاکان هەموو خاکی ژێر دەریای بە دەستەوە بوو و سەرپەرشتی دەکرد، پاشا لە کۆشکێکدا دەژیا کە لە سەدەف و مرواری گرانبەها دروست کرابوو لەگەڵ شەش کچە پەری دەریاکەیدا، بە درێژایی ڕۆژ پەریەکان لەناو ئاوە پاک و شینەکەدا یاریان دەکرد، بەڵام ئەوان ڕێگەیان پێنەدەدرا کە سەر بکەون بەرەو ڕووی دەریاکە و تەماشای ئەو جیهانە بکەن کە مرۆڤەکان تێیدا دەژیان. بەتەمەنترین شازادەیان دەیووت: چیرۆکەکان وا دەگێڕنەوە کە مرۆڤەکان قاچی سەیریان هەیە لە جیاتی کلک، دانەیەکی تریان دەیوت: بەڵێ وایە لەسەر وشکانی دەژین نەک لە دەریادا، لەولاوە شازادەیەکی گەنج هەناسەیەکی هەڵکێشاو ووتی: خۆزگە بمتوانیایە ئەو زەویە ببینم کە ئەوان لەسەری دەژین، تۆ زۆر گەنجیت بەڵام من سەرگوزەشتەی سەیرت لەسەر ژیانی مرۆڤەکان بۆ دەگێڕمەوە، دایکی وای ووت و هەموو شەوێک لەو کاتەی کە ڕەنگی شینی دەریاکە دەگۆڕا بۆ ڕەش و بەردەوام دەبوو شازادە گەنجەکە گوێی بۆ چیرۆکەکان ڕادەگرت، شازادە گەنجەکە گەورە بوو تاکو خۆی مرۆڤەکان ببینێ، دوای ئەوەی ساڵەکان بەسەرچوون، شازادەکان گەورە بوون ڕێگەیان دا تاکو بۆ یەکەم جار تەماشای جیهانی دەرەوەیان بکەن وە کاتێک گەڕانەوە سەرگوزەشتەی شاری گەورەیان لەگەڵ



خۆياندا هێنايەوە كە پڕ بوون لە گڵۆپ و ڕووناكی و قاپی گەورە كە مرۆڤەكانی لەسەر بوون و بە دەرياكەدا هەڵيان دەگرت (مەبەستيان بەلەم بوو). دوای ئەوەی شازادەكان گەشتی خۆيان كرد و لە كۆتاييدا نۆرەی بچوكترين شازادە هات تاكو گەشت بكات بۆ بينينی خاكی مرۆڤەكان، لە خۆشيدا لە شوێنی خۆی هەڵدەبەزييەوە كەڕۆيشت بەرەو سەر ڕووی دەرياكە لە دوورەوە يەكێك لەو كەشتيانەی بينی كە خوشكەكەی بۆی وەسف كردبوو، شازادە گەنجەكە بەرەو ڕووی كەشتيەكە مەلەی كرد و تاكو لە نزيكەوە كەشتيەكە ببينێ، كاتێك كە نزيك بووەوە لەسەر ڕووی كەشتيەكە گەنجێكی جوان و قۆزی بينی كەلەگەڵ هاوڕێيەكيدا قسەی دەكرد و پێ دەكەنی، دواتر ئاسمان تاريك بوو گەردەلولێكی بە هێز هەڵی كرد ،كەشتيەكە كەوتە بەر شەپۆلە بەهێزەكانی گەردەلولەكە كەشتيەكەی بەملاو بەولادا خست و گەنجەكەی فڕێدايە ناو ئاوەكەوە ، پەری دەريا بچووكەكە زانی كە كوڕە گەنجەكە دەخنكێت ئەگەر يارمەتی نەدات، هەر بۆيە يارمەتی داو لە باوەشی گرت و ڕزگاری كرد و لەسەر لمی قەراغ دەرياكە دواينا، پەری دەريا بچووكەكە لە شوێنێكی تاڕاددەيەك دوورەوە چاودێری دەكرد تاكو بزانێ چی ڕوودەدات، دوای ماووەيەك چەند كچێك هاتن و شازادە گەنجەكەيان دۆزييەوە ،شازادە گەنجەكە بە هێواشی چاوەكانی كردەوەو ووتی: كوا ئەو كچە جوانەی كە منی ڕزگار كرد؟ بەڵام هيچ كام لە كچەكان پێيان نەوت، پەری دەريا بچووكەكە بە هێواشی دوور كەوتەوە ،بەڵام گرنگ نەبوو بەلايەوە كە چی كردووە بەڵام



هەرگیز ئەو کوڕە گەنجە لە یاد ناکات و کەوتە داوی خۆشەویستی ئەوەوە، چیتر نەیتوانی بەرگەی ئەو خۆشەویستیە بگرێت کە لە دڵیدا دروست بوو هەر بۆیە چووە لای جادووگەری دەریا و داوای یارمەتی لەو کرد، جادووگەری دەریا پێی ووت: کەواتە تۆ دەتەوێت ببیت بە مرۆڤ؟ئەمە تەواو بە ئازارە، تۆ دەزانی گۆڕینی کلکی پەری دەریا بۆ قاچ وەکو مرۆڤەکان پێویستی بەوەیە شت ببەخشی، دەبێ چی ببەخشم پێت؟ پەری دەریا بچووکەکە پرسیاری لێکرد و جادووگەرەکە ووتی: دەنگت، جوانکیلەکەم، ئیتر دەبم بە مرۆڤ، پەریە گەنجەکە وای ووت بەڵام جادووگەرەکە ووتی: نەخێر، لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت مرڤێک تۆی خۆش بوێت، بەڵام ئەگەر مرۆڤەکە کەسێکی تری خۆش بوێت ئەوا تۆ دەبیت بە کەف پێش ئەوەی ڕۆژ ئاوا بێت، هەربۆیە پەریە گەنجەکە لە پێناو خۆشەویستیدا بۆ کوڕە گەنجەکە دەنگی خۆی بە خشی بە جادووگەرەکەو بوو بە مرۆڤ، زۆری پێ نەچوو پەری دەریا بچووکەکە خۆی لەگەڵ ئەو خەڵکانەدا تێکەڵ کرد کە دەچوون بۆ کۆشکی شازادە گەنجەکە، هەر کە شازادە گەنجەکە پەری دەریا بچووکەکەی بینی داوای لێکرد کە هەمیشە لە نزیکی بێت، بەڵام پەری دەریا بچووکەکە یەک خەفەتی هەبوو ئەویش ئەوەبوو کە نەیدەتوانی قسە بکات بە شازادە بڵێ کەمن بووم تۆم ڕزگار کرد چونکە دەنگی خۆی بەخشی بە جادووگەرەکە لە پێنا و ئەوەی کە ببێت بە مرۆڤ، هەرچەندە شازادە سەرسام بوو بە پەری دەریا بچووکەکە و پڕ بەدڵ ئاواتی دەخواست ئەو کچە بدۆزێتەوە کە ڕزگاری کردووە لە خنکان



بەڵام نەیدەزانی کە ئەو کچەیە لە تەنیشتیەوەیە، ڕۆژێکیان بە پەری دەریا بچووکەکەی ووت: من دەچم بۆ وڵاتێکی دوور کە شازادەیەکی جوانی لێ دەژی ڕەنگە من بیکەم بە خێزانم و هاوسەرگیری لەگەڵ بکەم، پەری دەریا بچووکەکە بیری دەکردەوە کە ئەگەر کەسێکی تر بکات بە هاوسەری دڵی دەشکێت، کاتێک شازادە کچە جوانەکەی بینی سەرسام بوو بە جوانیەکەی و ووتی: دەبێت تۆ ئەو کچە بیت کە منی ڕزگار کردووە، هەر بۆیە شازادە بڕیاری دا هاوسەرگیری لەگەڵ بکات و ڕۆژی داهاتوویان دیاری کرد بۆ هاوسەرگیریەکەیان، پەری دەریا بچووکەکە دەیزانی کە ئەگەر شازادە کەسێکی تری خۆش بوێت پێش خۆر هەڵاتن ئەوا دەبێت بە کەف، ئەو ئێوارەیە پەری دەریا بچووکەکە لە لێواری کەشتیەکە وەستاو دەگریا فرمێسکەکانی وەکو مرواری دەهاتنە خوارەوە دەکەوتنە ناو دەریاکەوە، لە ناکاو خوشکەکەی بینی کەلە ژێر دەریاکەدا مەلەی دەکرد بە پەری دەریا بچووکەکەی ووت: دەتوانی خۆت ڕزگار بکەیت بەڵام دەبێت شازادە بەم چەقۆیە بکوژیت، پەری دەریا بچووکەکە چەقۆکەی هەڵگرت و ڕۆشت بۆ ژووری شازادەکە بەڵام کاتێک تەماشای کرد شازادە نووستبوو ،دەیزانی کە زۆری خۆش دەوێت هەربۆیە نەیتوانی هیچ لە شازادە بکات، هەر بۆیە بە خەمباریەوە خۆی فڕێدایە ناو دەریاکەوە بەڵام نەبوو بەکەف لە بری ئەوە بوو بە کچی هەواو هێزی ئەوەی پەیدا کرد کە بفڕێ و یارمەتی ئەو کەسانە بدات کە دڵخۆش نین، بۆ ڕۆژی دواتر، ئەو کاتەی کە کەشتی شاهانە لە دەریادا شازادەو بووکەکەی لەسەر بوون پەری دەریا بچووکەکە تەماشایەکی هەردووکیانی کرد و دواجار توانی پێبکەنێت.



# بەسەرهاتی شازادە سەندرێلا

دەگێڕنەوە کچێی ناسک و جوان هەبوو، بەڵام لە بەدبەختی ئەو دایکی نەخۆش کەوت و مرد، باوکی ژنێکی تری هێنا کە زۆر دڵڕەق و لە خۆبایی بوو، باوەژنەکەی دوو کچی هەبوو، ناویان ئەنستایا و جافوت بوو، لەدایکیان بێبەزەیی تربوون وە هەرسێکیان وەک خزمەتکارێک لە سەندرێلایان دەڕوانی، شەو و ڕۆژ کاریان پێدەکرد، بێوچان ئەرکە گرانەکانیان بەسەردا دەدا هەر لە ماڵ پاکردنەوەو جل شتن هەتا خواردن ئامادەکردن، وە کاتێک هەستی بە ماندوو بوون دەکرد لە کۆتایی ڕۆژدا لەنزیک ئاگردانەکەوە دادەنیشت، کە تەنها خۆڵەمێشی تێدا مابۆوە، هەر لەبەر ئەوەش ناویان لێنابوو سەندرێلا. ڕۆژێکیان، نێردراوی کۆشکی پاشایەتی گەیشت، کە هەموو وولات گەڕابوو، بۆ بانگهێشتکردنی هەموو کچانی مەملەکەت بۆ ئەوەی ئامادەبن لە ئاهەنگی سەماکردندا، کە شازادە لەو ئاهەنگەدا دەزگیرانێک بۆخۆی دەستنیشان دەکات. بەهۆی ئەو هەواڵەوە پشێوی کەوتە نێو ماڵەکەوە، مشتومڕ کەوتە نێوان دووکچەکەو دایکیان، کەچی لەبەر بکەن و چۆن خۆیان ئامادە بکەن بۆ ئەو ئاهەنگە؟ جافوت بە شپرزەییەوە ووتی: کام جلەیان لەبەر بکەم؟ ئەنستایا ووتی: کام پێڵاو هەڵبژێرم؟ ئەمە یان ئەوەیان؟ باوەژنەکە ووتی: کام ملوانکە لەمل بکەم؟ بەڵام سەندرێلا، کە هەرگیز نەیدەزانی ڕق و کینە چی یە،



یارمەتی خوشکەکانی دەدا بۆ لەبەرکردنی جلەکانیان و چاککردنی قژیان، وە دڵنیابوو لەوەی کە باوەژنە دڵڕەقەکەی هەرگیز ڕازی نابێت کە ئەم بەشداری بکات لە ئاهەنگەکەدا، وە لەڕاستیدا ئەم جلێکی جوان و قەشەنگی نیە لەبەری بکات. ڕۆژی ئاهەنگەکە، هەموو بەڕێکەوتن بەرەو کۆشکی شاهانە سەندرێلا هەستی بە خەمباری دەکرد، کاتێک بینی خوشکەکانی و باوەژنەکەی دوور دەکەوتنەوە، لەسەر کورسیەک دانیشت و فرمێسک لەچاوانی دەبارین، لەو چرکە ساتەدا دەنگێکی ناسکی بەرگوێ کەوت، پێی ووت: چی ڕوویداوە کچە جوانەکە.  سەندرێلا سەری هەڵبڕی بینی خانمێک بەدارێکی جادوییەوە لەبەر دەمیدا وەستاوە، فریشتەیەکی میهرەبان بوو، بەدەم هەنسک دانەوە سەندرێلا بۆی باسکرد، چەند ئارەزوو دەکات کە بەشداری ئەو ئاهەنگە بکات، فریشتە میهرەبانەکە ووتی: بەسە مەگری، ئێستا شتێک دەکەین. داوای لە سەندرێلا کرد بچێت لەباخەکەدا کولەکەیەکی گەورە بهێنێت لەگەڵ چوار مشک و جرجێک و دوو مارمێلکە.  سەندرێلا دەست بەجێ داواکارییەکانی بەجێ هێنا. پاشان بە دارە جادوییەکەی کولەکەکەی کرد بە گالیسکەیەکی ئاڵتوونی جوان، وە چوار مشکەکەی کرد بە چوار ئەسپی سپی سەرسوڕهێنەر، وە جرجەکەی کرد بە گالیسکەوان، وە دوو مارمێلکەکە بە دوو خزمەتکار، سەندرێلا سەری سوڕما لەوەی بینی، ووتی: زۆر جوانە بەڵام بەم جلە دڕاوانەوە ناتوانم بڕۆم بۆ ئاهەنگەکە. فریشتەکە ووتی: نیگەران مەبە، دەستبەجێ بەدارە جادوییەکەی، جلێکی زۆر جوان



و قەشەنگی کرد بەبەر سەندرێلادا، لەبری کۆنەکانی، هەروەها جووتێ پێڵاوی مرواری کردە پێی کە وێنەی نەبوو لەدنیادا. فریشتەکە پێی ووت: بەڵام ئاگاداربە ! کاریگەری جادووەکە تا کاتژمێر دوانزەی شەو دەخایەنێت، لەیادت نەچێت، دەبێت پێش ئەو کاتە بەماوەیەکی کەم ئاهەنگەکە بەجێبهێڵێت. سەندرێلا وەڵامی دایەوە: تێگەیشتم، بەڵێن دەدەم، پاشان سوپاسی فریشتەکەی کردوو بەڕێکەوت. کاتێک گەیشتە کۆشکەکە، بەرەو ئەو هۆڵە گەورەیە ڕۆشت کە ئاهەنگەکەی تێدا سازکرابوو، بە گەیشتنی بۆناو هۆڵەکە سەرجنی هەموو ئامادەبوانی بەلای خۆیدا ڕاکێشا، کەس نەیدەناسی، بەڵام دەربارەی هەمووی کەوتنە مقۆ مقۆ: دەبێت کێ بێت؟ ئەم هەموو جوانیە چیە؟ لەکوێوە هاتووە؟ تەنانەت زڕخوشکەکانی بیریان بەلای ئەودا نەدەچوو کە ئەوە زڕ خوشکەکەی خۆیان بێت، شازادە دەست بەجێ سەرسامی بوو، بەڕاستی لەهەموو کچانی بەشداربووی نێو ئاهەنگەکە جوانتربوو، شازادە داوای لێکرد سەمای لەگەڵدا بکات وە بەدرێژایی شەو سەمایان کرد، سەندرێلا شادمان و کەیف خۆش بوو تەنانەت ئاگاشی لەکات نەمابوو، سەندرێلا هاواری لە گالیسکەوانەکە کرد: بەخێرایی! بەخێرایی! بەرەو ماڵەوە، لەگەڵ دواین لێدانی زەنگەکەدا گەیشتەوە ماڵەوە، لەو ساتەدا هەموو شتەکان وەک خۆیان لێهاتەوە. ... و جرجەکەو مارمێلکەکان، هەموو گەڕانەوە دۆخی جارانیان لویەرگەکەی



دەپرسی لەسەر یەکێک لە پلیکانەکان بەخەمبارییەوە دانیشت، پێڵاوە مرواریییەکەی سەندرێلای بینی کە بەجێمابوو، هەڵیگرتەوە. شازادە بەخۆی ووت: بەهۆی ئەم پێڵاوەوە، دەیدۆزمەوە! فەرمانی بەدەست و پێوەندەکانی دا کە بگەڕێن بەدوای خاوەنی ئەو پێڵاوەدا. هەموو کچانی مەملکەت پێڵاوەکەیان تاقیکردنەوە، بەڵام بە پێی هیچ کامێکیان نەبوو، تا نێردراوەکەی شازادە گەیشتە ماڵی سەندرێلا. جافوت و ئەفستایا بەهەڵە داوان ڕایانکرد بۆ تاقیکردنەوەی پێڵاوە مرواریییەکە، زۆر هەوڵیاندا لە پێی بکەن بەڵام بێهودە بوو، چونکە پێیان زۆر لەوە گەورەتر بوو ئەو پێڵاوە لە پێبکەن. لەو کاتەدا سەندرێلا هاتە ژوورەوەو پرسی، دەتوانم منیش پێڵاوەکە تاقیبکەمەوە؟ زڕ خوشکەکانی بەڕویدا هەڵشاخان و وتیان: بەڵام ئەم لە ئاهەنگەکەدا ئامادە نەبووە؟. نێردراوەکە وەڵامی دایەوەو ووتی: فەرمانم پێدراوە پێڵاوەکە هەموو کچانی مەملەکەت تاقیبکەنەوە بەبێ جیاوازی. سەندرێلا پێڵاوە مرواریییەکەی لە پێکرد، بەدڵنیاییەوە پڕ بە پێی بوو، لەو کاتەدا جافوت و ئەفستایا بەسەر سوڕمانەوە لەسەندرێلایان ڕوانی و بۆیان دەرکەوت کە کچی ئاهە نگەکە سەندرێلا بووە، وە لەسەندرێلا پاڕانەوە کە لێیان ببورێت، ئەویش بە بێ هیچ دوو دڵیەک لێیان خۆش بوو. نێردراوەکەی شازادە سەندرێلای لەگەڵ خۆیدا برد بۆ کۆشکەکە، پاش چەند ڕۆژێک مەملەکەتیان ڕازاندەوەو خۆیان ئامادەکرد بۆ گێڕانی ئاهەنگی زەماوەندی شازادەو سەندرێلا، ئیتر سەندرێلا بوو بە ژنی شازادەی وڵا.



# (دەنکە هەنارە)

# کچەی بەفرو حەوت کورتە باڵاکە

لە ڕۆژێکی زستاندا شاژن لە بەردەم پەنجەرەی قەڵاکەدا دانیشتبوو خەریکی چنین بوو لەو کاتەی کە دەیچنی پەنجەی بریندار بوو و سێ دڵۆپە خوێن کەوتە سەر بەفری لێواری پەنجەرەکە کە ڕەنگی ڕەش بوو، هیوادارم کچێکم هەبێ ڕەنگی پێستی وەکو بەفر سپی بێت، لێوەکانی وەکو خوێن سوور بێت، قژیشی وەکو لێواری پەنجەرەکە ڕەش بێت، شاژن هەناسەیەکی هەڵکێشاو و وای ووت، زۆری پێنەچوو شازادە کچێکی جوانی بوو بەو شێوەیەی کە وەسفی دەکرد، ناوی کچەکەی نا بەفری سپی، بەڵام بە داخەوە شاژن زۆری پێنەچوو کۆچی دوایی کرد، مناڵەکەی لەلای باوکی بەجێ هێشت کە پاشا بوو، پاشا هاوسەرەکەی زۆر خۆش دەویست بەڵام دوای تێپەڕبوونی چەند ساڵێک بەسەر مردنی شاژندا هەستی بە تەنیایی کرد و بڕیاری دا کە جارێکی تر هاوسەرگیری بکات، هاوسەرە نوێیەکەی زۆر جوان بوو بەڵام دڵێکی ساردی هەبوو هەموو شەوێک تەماشای ئاوێنە سیحراویەکەی دەکرد و لێ ی دەپرسی: ئاوێنە، ئاوێنەی سەردیوارن، کێ جوانترە



له هەموان؟ ئاوێنەکەش وەڵامی دایەوەو وەیوت: جوانەکان زۆرن کە بەراوورد ناکرێن، بەڵام تۆ جوانی جوانەکانی، شاژنە نوێیەکە منالّی خۆش نەدەویست و دڵنیا بوویەوە لەوەی کە هەگیز بەفری سپی نەبینێ، نەیدەزانی کە شازادە تابێت جوانترو خۆشەویستر دەبێت، لە کۆتاییدا لەو کاتەدا پرسیاری لە ئاوێنەکە کرد، ئاوێنە، ئاوێنەی سەر دیوارن، کێ جوانترە لە هەمووان، ئاوێنەکە وەڵامی دایەوە ووتی: تۆ، شاژن جوانێکی کە بەراوورد ناکرێت، بەڵام بەفری سپی جوانی جوانەکانە، شاژن کە گوێی لە ئاوێنەکە بوو پێی ووت: بەفری سپی لە تۆ جوانترە، زۆر تووڕە بوو بە شێوەیەک ئارامی لێبڕا، یەکسەر فەرمانی بە ڕاوچییەک کرد کە بەفری سپی ببات و لە دارستانەکە سەری ببڕێت، پێی ووت: کە کوشتتان دڵی بەفری سپیم بۆ بهێنن بۆ ئەوەی دڵنیا بم لەوەی کە مردووە. ڕاوچییەکە هێندە توندوتیژ نەبوو کە بەفری سپی بکوژێت بەڵام لە هەمان کاتدا لە ژیانی خۆیشی دەترسا، هەر بۆیە بەفری سپی لەگەڵ خۆیدا برد بۆ چڕترین بەشی دارستانەکە، بەڵام کاتێک تەماشای دەم و چاوە خۆشەویستەکەی بەفری سپی کرد دەستی تێ نەچوو بیکوژێت لە جیاتی ئەوەی دڵی بەفری سپی بباتەوە بۆ شاژن ئاژەڵێکی ڕاوکردوو دڵی ئاژەڵەکەی لەگەڵ خۆیدا برد بۆ شاژن تاکو هەڵخەڵتێنێت، لە



دارستانەکە بەفری سپی بە تەنها مایەوە و شەوی بەسەردا هات زۆر هەستی بەترس کرد خۆی لە ناو دارەکاندا دەشاردەوە نەیدەزانی بەرەو کوێ بڕوات و ڕوو بکاتە کوێ، لە کۆتاییدا خانوویەکی بچوکی بینی بە ترس و دڵە ڕاوکێیەوە خۆی کرد بە ژووردا زۆر خەوی دەهات. لە ژوورەوە حەوت شوێنی نوستن ڕاخرابوو لەسەر یەکێک لەو شوێنانە نوست، دوای چەند کاتژمێرێک بەفری سپی لە خەو هەستاو و حەوت پیاوی بچووکی بینی کە بەسەر یەوە بوون و تەماشایان دەکرد، لە سەرەتادا هەستی بەترس دەکرد بەڵام دوای ئەوەی سەر گوزەشتەو چیرۆکی ژیانی خۆیان باس کرد حەوت پیاوە کورتە باڵاکە زۆر بە میهرەبانیەوە قسەیان لەگەڵ دەکرد و پێیان ووت: چەندە منداڵێکی داماویت، بە دڵنیایەوە دەتوانی لەگەڵ ئێمەدا بژیت و بمێنیتەوە بەڵام پێویستە زۆر ووریا بیت لەو شاژنە دڵ ڕەق و بێ بەزەییە ڕەنگە بتدۆزێتەوە و بەوە بزانێ کە تۆ هێشتا زیندوویت و ڕاوچیەکە تۆی نەکوشتووە، بەفری سپی لەوماڵەدا مایەوە و چاودێری حەوت پیاوە کورتە باڵاکە و ماڵەکەیانی دەکرد، زۆر دڵ خۆش بوو هەرچەندە کە بە تەنها دەمایەوە و کورتە باڵاکان هەموو بەیانیەک دەچوون بۆ سەر کارەکانیان، ڕۆژێکیان پیرە ژنێک لە دەرگای داو دەیووت: شتی جوان بۆ کچی جوان، بە فری سپی



دەرگاکەی بە پەرۆ شیەوە کردەوە، زۆر دڵ خۆش بوو کە کەسێک هاتۆتە سەردانی کردنی بەڵام نەیدەزانی کە ئەو پیرە ژنە جادووگەرەکەی شاژنەکەیە و بە بەفری سپی ووت: با ئەم شریتە جوانە لە گردنت ببەستم، بەفری سپی شریتەکەی لە مل کرد بەڵام بەرەبەرە هەستی کرد شریتەکە توند دەبێت لە ملیدا تا ئەو کاتەی کەوتە سەر زەوی و وای زانی مردووە .ئەو شەوە کە کورتە باڵاکان گەڕانەوە بینیان کە هاوڕێکەیان لەسەر زەویەکە کەوتووە، توانیان چارەسەری بکەن و بیگەڕیننەوە بۆ ژیان بەڵام تۆزێک بە مۆنی و تووڕەییەوە قسەیان لەگەڵ دەکرد و پێیان دەووت: هەرگیز نابێت دەرگا بۆ هیچ کەسێکی تر بکەیتەوە جارێکی تر، ئەمجارە بەختت هەبوو بەڵام جارێکی تر ڕەنگە بەخت یاوەرت نەبێت، کات تێپەڕی و هەموو شتێک باش بوو بەڵام دوای چەند مانگێک پیرە ژنێک هات و سەبەتەیەک سێوی پێبوو و لە دەرگاکەی داو ووتی من نایەمە ژوورەوە ،ئازیزم تەنها ئەم سێوە تایبەتانەت لە ڕێی پەنجەرەکەوە دەدەمێ، هیچ شتێکی وا شیرینت تا ئێستا تام نەکردووە، بەفری سپی داماوە قەپاڵێکی لە سێوەکەدا، سێوە کە ژەهراوی کرابوو، کاتیک کورتە باڵاکان گەڕانەوە هەرچیەک کەلە توانایاندا هەبوو کردیان بۆ



ڕزگارکردنی بەڵام نەیانتوانی هەموویان وایانزانی کە ئەمە کاری شاژنەکەیە هەرچەندە بەفری سپی مردبوو بەڵام نەیاندەتوانی بینێژن، هەر بۆیە خستیانە ناو کفنێکی شووشەوە تاکو بەردەوام ببینن، ڕۆژێکیان شازادەیەکی ئەسپ سوار هات، ئەو کاتەی کە بەفری سپی بینی کەوتە داوی خۆشەویستییەوە بە کورت باڵاکانی ووت: لەبەر ئەوەی کە ناتوانێ ببێت بە هاوسەرم ڕێگەم بدەن بیبەم بۆ کۆشکەکەم و لەو شوێنە دای بنێم کە شایەنێتی، کورتە باڵاکان ڕازی بوون، شازادە فەرمانی بە پیاوەکانی کرد کە بەفری سپی بە کفنەکەیەوە هەڵبگرن، بەڵام لەو کاتەی کە هەڵیان گرت ئەو پارچە سێوەی لە قوڕگی بەفری سپی دا مابووەوە دەرچوو، هەموویان سەرسام بوون بەم ڕووداوە، بەفری سپی جارێکی تر زیندووبووەوەو قۆڵەکانی ڕاکێشاو هەستایەوە و یەکەم کەس کە چاوی پێکەوت شازادەیەکی گەنجی جوان بوو کە بە ڕوویدا پێدەکەنی، بە دڵنیاییەوە بەفری سپی شووی بە شازادە کردوو هەموو کورتە باڵاکان سەمایان دەکرد لە ئاهەنگی هاوسەرگیریەکەدا، شاژنە شەڕانگێزەکەش لە تووڕەیی و ئیرەیی دا سەری خۆی هەڵگرت و جارێکی تر نەبینرایەوە.



# بەسەرهاتی شازادە راپۆنزڵ

هەبوو نەبوو شانشینێک هەبوو، لەلایەن پاشایەکی میهرەبان و شاژنێکەوە بەڕێوە دەبرا، ژیانێکی زۆر خۆشیان دەبردە سەر تا رۆژێک شاژن نەخۆش کەوت، پاشا زۆر نیگەران بوو بۆیە فەرمانی بە پاسەوانەکانی کرد تا بچن گوڵێکی سحراوی بنێژن کە هێزی چاکردنەوەی نەخۆشی هەبێت!، بەڵام گوڵەکە هی ژنێکی جادووگەر بوو کە ناوی دایکە گۆسێڵ بوو، دایکە گۆسێڵ زۆر توڕە بوو کە گوڵە سحراویەکەی لەدەستداوە بۆیە هەر کە شاژن چاکبوەوە و منداڵێکی بوو ژنە جادووگەرەکە منداڵەکەی لێفڕاندن، دایکە گۆسێڵی جادووگەر کچەکەی لە ناو قوللەیەکدا شاردەوە و ناوی نا راپۆنزڵ وای لە قژی کچەکە کرد کە هەمان هێزی گوڵەکەی هەبێت لە چاکردنەوەی نەخۆشیدا و درێژ درێژی کردەوە، دایکە گۆسێڵ کچەکەی بەکارهێنا بۆ ئەوەی هەمیشە بەگەنجی بمێنێتەوە!، و پێ ی ووت کە من دایکی راستەقینەتم، هەموو ساڵێک لە ساڵرۆژی لەدەستدانی کچەکەیان پاشا و شاژن هەڵدەستان بە ناردنی رووناکی لە رێگەی فانۆسەوە بۆ ناو تاریکی ئاسمان، راپۆنزڵ رووناکیەکانی دەبینی کە چۆن بەرەو ئاسمان هەڵدەکشان و دەیویست لە نزیکەوە



تەماشایان بکات بەڵام هەمیشە دایکە گۆسێڵ ڕێگری لێدەکرد، ڕۆژێکیان دایکە گۆسێڵ لە قوللەکە دوورکەوتەوە کەسێکی نەناسراو بە قوللەکەدا سەرکەوت، راپۆنزڵ زۆر ترسا بۆ بەرگری کردن لە خۆی بە تاوەی سور بووەوە لێی دا و بە کورسیەکەوە بەستیەوە دواتر  بە ناو جانتا کەیدا گەڕا تاکو تاجێکی دزراوی دۆزیەوە و ویستی لەسەری بکات و تاقی بکاتەوە، کەسە نەناسراوەکە ناوی فیلین رایدەر بوو دزێکی هەڵهاتوو بوو، بەڵام راپۆنزڵ بە تەنیا هەلی دەزانی کە فیلین بتوانێ یارمەتی بکات تا بتوانێ لە نزیکەوە ئەو رووناکیانە ببینیت کە بەرەو ئاسمان هەڵدەکشان، بۆیە راپۆنزڵ بە فیلینی ووت: کە ئەگەر یارمەتی بدات ئەوا تاجەکەی دەداتەوە، بەڵام فیلین نەیدەویست بچێت بۆ شار چونکە خۆی لە براکانی ستابێنگ تۆن دەشاردەوە کە دوو دز بوون پێشتر دزی لەگەڵدا کردبوون و سەرباری ئەوەی کە کۆشکەکەش پاسەوانی هەبوو بەڵام فیلین لەبەرخاتری ئەوەی تاجەکەی دەست بکەوێتەوە نەیدەتوانی بڵێ نا، بە دوودڵیەوە فیلین لە قوللەکەکە هاتە خوارەوە و راپۆنزڵ یش قژە درێژەکەی بەکارهێنا تا لە قوللەکە پێی بێتە خوارەوە، راپۆنزڵ یەکەم جاری بوو لە قوللەکە بێتە خوارەوە بۆ ئەو وەکو خەوێک وابوو کە دەرەوە ببینێت، پێشتر تا ئەو کاتە راپۆنزڵ بەسەر گیادا ڕاینەکردبوو، بەسەر دارا سەرنەکەوتبوو، لە ناو گوڵەکاندا دانەنیشتبوو هەرچەندە بینینی ئەو شتانەی دەرەوە



خۆشبەختی کردبوو بەڵام هێشتا هەر نیگەران بوو چونکە دایکە گۆسێڵ هەمیشە دەیووت کە جیهانی دەرەوە زۆر ترسناکە، بیری دەکردەوە تۆ بڵێی دایکە گۆسێڵ درۆی کردبێت راپۆنزڵ لەبەر خۆیەوە دەیگووت نا دایکە گۆسێڵ درۆ ناکات، فیلین ویستی راپۆنزڵ بیترسێنێ بردی بۆ ترسناکترین شوێن کە تا ئەو کاتە زانیبێتی ئەو شوێنە ناوی سنەگڵی دەنکەن بوو کە مەیخانەیەک بوو پڕ بوو لە چەقۆ کێش، بەڵام کاتێک راپۆنزڵ چیرۆکی بینینی رووناکیەکانی لە ئاسمان بە گۆرانی بۆ ووتن هەموویان بوون بە هاورێی، چەقۆ کێشەکان رێگایەکی نهێنییان بە فیلین و راپۆنزڵ پیشان دا لە لێوەی ڕابکەن پێش ئەوەی پاسەوانەکانی کۆشک بێنە مەیخانەکە و دەستگیریان بکەن، بەڵام لە رێگاکەیاندا فیلین دەستی بریندار بوو راپۆنزڵ بە قژە سحراویەکەی برینەکەی بەست و چاکیکردەوە، فیلین کە بینی برینەکەی دەستی چاکبوەوە زۆر سەرسام بوو دواتر راپۆنزڵ بۆی روونکردەوە کە قژی هێزی چاکردنەوەی تێدایە بەڵام ئەگە بێتوو یەک جار بیبرێت ئەوا ئەو هێزە سحراوییە لە دەست ئەدات، دوای ئەوەی دایکە گۆسێڵ گەڕایەوە بۆ قوللەکە و بینی کە راپۆنزڵ لە قوللەکە نەماوە ئەوا یەکسەر دەستی کرد بە گەڕان بە دوایدا، رۆژی دواتر رۆژی لە دایک بوونی راپۆنزڵ بوو، فیلین راپۆنزڵ ی برد بۆ شارۆچکەکە کە شارۆچکەیەکی زۆر دڵگیر و سەرنج راکێش بوو، راپۆنزڵ و فیلین پێکەوە سەمایان کرد و کێکیان خوارد دواتر سواری



بەلەمێک بوون و بەرەو کەنارەکە رۆشتن لەوی سەیری ئەو رووناکیانەی کرد کە بەرەو ئاسمان هەڵدەکشان، شەو هات و رووناکیەکان لە ئاسمان دەدرەوشانەوە ئاسمانیان پڕ کردبوو لە رووناکی ئیتر لەسەر بەڵێنەکەی خۆی راپۆنزڵ تاجەکەی گەڕاندەوە بۆ فیلین، فیلین رۆشت بۆ لای براکانی ستابێنگ تا وەکو تاجەکیان پێبدات بەڵام دزەکان لە فیلینیان دا و رۆشتن بۆ لای راپۆنزڵ و پێیان ووت کە فیلین بازرگانی پێوە کردووە تاجەکەی داوە پێمان لەبەرامبەر تۆدا، راپۆنزڵ هاواری کردو ووتی: نا! وازم لێبێنن و ویستی ڕابکات بەڵام نەیتوانی، لەناکاو دایکە گۆسێڵ دەرکەت و راپۆنزڵ ی لەدەست دزەکان رزگارکرد، راپۆنزڵ بەوەی نەدەزانی کە دایکە گۆسێڵ دزەکانی ڕلسپردبوو تا راپۆنزڵی بۆ دەستگیر بکەن، دایکە گۆسێڵ راپۆنزڵ ی جارێکی تر بردەوە بۆ قوللەکە، راپۆنزڵ بیری لە هەموو ئەو شتانە دەکردەوە کە لە دەرەوە بینیبووی، دوای بیرکردنەوەیەکی زۆر بۆی دەرکەوت کە ئەو شازادە وونبوەکەیە! دایکە گۆسێڵ نەیتوانی چیتر وەکو کەسێکی باش خۆی دەربخات هەربۆیە راپۆنزڵی بەستەوە تا رێگری لە ڕاکردنی بکات، کە فیلین هات و ویستی راپۆنزڵ رزگاربکات دایکە گۆسێڵ پەلاماری دا و نەیهێشت لە ئەنجامدا فیلین بە توندی ئازاری پێگەیشت، راپۆنزڵ دەیزانی کە دەتوانێ بە قژە سحراویەکەی چارەسەری بکات بەڵام لەبەر ئەوەی بەسترابووەوە نەیدەتونی هیچی بۆ بکات لە کاتێکدا کە زۆر پەرۆشی فیلین



بوو، هەر بۆیە بەڵێنی بە دایکە گۆسێڵ دا کە ئەگەر ڕێگەی بدات فیلین چارەسەر بکات ئەوا بۆ هەتا هەتایە لەگەڵیدا دەمێنێتەوە، سوێندم بۆ بخۆ کە بەجێم ناهێڵیت، دایکە گۆسێڵ بە راپۆنزڵی ووت: سوێندت بۆ دەخۆم، راپۆنزڵ وەڵامی دایەوە، بەڵام فیلین ئەوەی ڕەتکردەوە کە واز لە دایکە گۆسێڵ بهێنێ کەوا سەرکەوتوو بێت بۆیە هەر کە راپۆنزڵ لە فیلین نزیک بووەوە پارچە شوشەیەکی گرت بە دەستیەوە و قژی راپۆنزڵی بڕی کتو پڕ دایک گۆسێڵ لە پێش چاویان پیر پیر بوو، دوای کەمێک دایکە ڕۆسێڵ مرد بەڵام فیلین چاک نەبووەوە و راپۆنزڵ یش قژەکەی ئەو هێزە سحراوییەی لە دەست دا کە برینی فیلینی پێ چاک بکاتەوە، بۆیە راپۆنزڵ لە بێدەسەڵاتیدا دەستی کرد بە گریان و فرمێسکێکی کەوتە سەر فیلین یەکسەر فیلین چاوەکانی کردەوە و ئەو سحرە کە لە فرمێسکەکانی راپۆنزڵدا بوو توانی ژیانی فیلین بپارێزی، دواری رزگاربوونیان هەردووکیان ڕۆشتن بۆ کۆشکە کە و لەوێ راپۆنزڵ پێشوازی لێکرا لەلایەن دایک و باوکی ڕاستەقینەی شاو شاژن ئێجگار دڵخۆش بوو بە گەڕانەوەی کچەکەیان دوای تێپەڕبوونی ئەو هەموو ساڵە، هەرچەندە راپۆنزڵ هێزی سحراویەکەی لە دەستدا بە هۆی بڕینی قژییەوە بەڵام وەکو کچێکی زۆر سەرنج ڕاکێش مایەوە کە تائێستا فیلین بینیبێتی.



# بەسەرهاتی شازادە بۆق

لە شوێنێکی دوورە دەست پاشایەک دەژیا کە حەوت کچی جوانی هەبوو بەڵام بچووکترینیان جوانترینیان بوو و پاشاش لە هەموویان زیاتر ئەوی خۆش دەویست، ناخۆش بەختانە خراپ بوو و وا ڕا هاتبوو کە شێوازی تایبەتی خۆی هەبێت، هیچ شتێکی بینراولە نزیکەوە ڕێگەی پێنەدەدا ڕوویدات تەنها خۆی، خۆی دڵخۆش دەکرد لە بەیانیەوە تاکو ئێوارە، ڕۆژێکیان شازادەی بچووک ڕۆشت بۆ دارستانەکەی نزیک کۆشکەکە و لەوێ لە ژێر دارێک دانیشت نزیک بیرێکی کۆن کە زۆر سارد بوو، هەر کە دانیشت زۆر بە ووریاییەوە تۆپە ئاڵتوونەیەکەی بۆ ئاسمان فڕێ دەداو دەیگرتەوە، بەڵام ئەو بیری لە شتێکی تر دەکردەوە دەبێت ئەوەی کە بزانێ چی ڕوودەدات  تۆپەکەی کەوتە ناو بیرێکی قوڵەوە، شازادە گەنج زۆر بە تووڕەیی یەو قاچەکانی کێشا بە زەویدا، زۆر هۆگری تۆپە ئاڵتونیەکەی بوو زۆر ڕقی لەوە بوو کەبەو شێوەیە نەبوو کە ئەو دەیویست، هەر بۆیە خۆی فڕێدایە سەر زەوی یەکەو قاچەکانی ئەدا بە زەوی داو زۆر بە توندی دەگریا، لەو کاتەدا دەنگێک لەو نزیکەوە قیراندی و ووتی: شازادە من دەتوانم یارمەتیت بدەم ئەگەر ڕێگەم بدەیت، شازادە لە گریان وەستاو تەماشایەکی کردو چاوی سڕی و لە دووری سێ سانتیمەترەوە بۆقێکی گەورەی سەوز وەستا بوو ،شازادە هاواری کرد و ووتی:



دوورکەوەرەوە مەخلوقی ناشرین و پیس، چۆن دەتوانی یارمەتیم بدەی؟ بۆقەکە ووتی: من دەتوانم باز بدەمە ناو بیرەکەو تۆپە ئاڵتونیەکەت بۆ بهێنمەوە، شازادە بە گومانەو پرسیاری لە بۆقەکە کرد، ئەی چیت ئەوێت لە بەرامبەر ئەو یارمەتیدانەت؟ بۆقەکە ووتی: تەنها بمکە بە هاوڕێی خۆت، هەندێک جار یاریم لەگەڵ بکەو ڕێم بدە لە قاپەکەی تۆ نان بخۆم و لەسەر سەرینەکەی تۆ بخەوم، هەمیشە هەوڵی خۆم دەدەم کە یارمەتیت بدەم، شازادە بۆ چەند ساتێک بیری کردەوە، هیچ بیری لە هاوڕێیەتی لەگەڵ بۆقدا نەکردبۆوە بەڵام زۆر بەپەرۆش بوو کە تۆپە ئاڵتونیەکەی بۆ بگەڕێتەوە بۆیە ڕازی بوو بە داواکاریەکەی بۆقەکە، کەمتر لە خولەکێک بۆقەکە بازیدا بۆ ناو بیرەکە و تۆپە ئاڵتونیەکەی بۆ شازادە هێنایە دەرەوە، دواتر تا توانی بە ڕاکردن گەڕایەوە بۆ کۆشکەکە لە دوایەوە گوێی لە دەنگێکی نزم بوو بەڵام هیچ گرنگی پێنەدا، شازادە بڕوای وابوو کە ئەوە دوا جاری بێت کە بۆقەکە ببینێت و جارێکی تر نایبینێتەوە بەڵام ئێوارەی ئەو ڕۆژە لەو کاتەی کەلەگەڵ باوکی و شەشە خوشکەکەی دانیشتبوون بۆ خواردنی نانی ئێوارە، کەسێک لە دەرگای دا بینی یەکێک لە خزمەتکارەکان بوو هات بۆ لای شازادەی بچوک و ووتی: بۆقێک لە دەرەوە داوای تۆ دەکات، شازادە ووتی: پێی بڵێ کە کاتم نیە سەرقاڵم ،ئێستا ناتوانم ببینم، بەڵام کاتێک پاشا کوێی لە قسەکانی بوو لە خزمەتکارەکەی پرسی ئەوە کێیە لەبەر دەرگا؟ شازادە تەواوی بەسەر هاتەکەی گێڕایەوە و ووتی: بەڵام من



ناتوانم بۆقێک لەسەر مێزی نان خواردنەکە لەگەڵم بێت، پاشا تەماشایەکی شازادەی کرد و ووتی: کچم، پەیمان پەیمانەو دەبێ پابەند بیت پێوەی ئازیزەکەم،بچۆ یەکسەر بۆقەکە بهێنە، هەست بە شەرمەزاری دەکەم کاتێک ببینم کە یەکێک لە کچەکانم لە پەیمانەکانیان پاشگەز بوونەتەوە، شازادە بە هێواشی بەرەو دەرگاکە ڕۆشت و دەستە سڕیکی دەرکرد و بەکاری هێنا بۆ ئەوەی بۆقەکەی پێ بگرێت و بۆقەکەی هێنایە سەر مێزی نان خواردنەکە، پاشا بە شازادەی ووت: هەندێک خوادن بۆ بۆقەکە داوابکە، شازادە ئەوەی کرد کە باوکی پێی ووت، کە شەو هات و کاتی خەو نزیک بووەوە شازادە هەوڵی دا بۆقەکە بە جێ بهێڵێت لە ژووری نان خواردنەکەو نەبات بۆ ژووری نوستنەکەی، پاشا بە شازادەی ووت: ئازیزم، ئایا تۆ شتێکت بیر نەچووە، دەبێ بۆقەکە هەڵبگریت و لەگەڵ خۆتدا بیبەیت بۆ ژووری نوستنەکەت وەکو ئەوەی بەڵێنێت بە بۆقەکە داوە، بۆقەکە پاڕایەوەو ووتی: ئێستا بەرزم بکەرەوە بۆ سەر سەرینەکەت، شازادە زۆر بە تووڕەیی ئەوەی کرد کە بۆقەکە داوای کرد و لەسەر سەرینەکەی داینا، بەڵام شتێکی سەیر ڕوویدا، لە پێش چاوی شازادە بۆقەکە بوو بە میرێکی زۆر جوان کە بە ڕووی شازادە بچووکەکەدا پێدەکەنی و بە شازادەی ووت: من جادووم لێکراوە لەلایەن جادووگەرێکی خراپەوە، تەنها میهرەبانی شازادەیەک دەیتوانی من بکاتەوە بە مرۆڤ، دواتر شازادە زۆر دڵخۆش بوو بەوەی کە بەڵێنەکەی بردۆتە سەر، دوای چەند مانگێک هاوسەرگیریان کردوو بۆ هەمیشە میهرەبان و بەبەزەیی بوو بەرامبەر بە هەموو زیندەوەرەکانی شانشینەکەیان.



# بەسەرهاتی دڕندە و شاجوان

سەردەمانێک لە وڵاتێکی دوور، شازادەیەکی گەنج لە کۆشکێکی درەوشاوەدا دەژیا، هەموو شتێکی هەبوو کە دڵی ئارەزوی دەکرد، بەڵام خۆ ویست و دڵ ڕەق بوو، شەوێکی زستان جادووگەرێک هات بۆ کۆشکەکەی، خۆی گۆڕی بوو بە پیرەژنێکی سواڵکەر، لە کاتی گەڕانەوەیدا گوڵێکی پێشکەش کرد بۆ ئەوەی لە سەرما بی پارێزێت، بەڵام شازادەکە گاڵتەی بە دیارییەکەی پیرەژنەکە دەرکرد، لەبەر ئەوە جادووگەرەکە شازادەی گۆڕی بۆ دڕندەیەکی ناشیرین، هەموو خزمەتکارەکانیی گۆڕی بە کەلوپەلی ناوماڵ، تەنها بەخۆشەویستی کاریگەری جادووەکە نەدەما، دەبێت یەکێک بکەوێتە داوی خۆشەویستی شازادە پێش ئەوەی دوایین پەڕەی گوڵە جادووییەکە بوەرێت، شەرمی لە ناشیرینییەکەی خۆی دەکرد، دڕندەکە لەژوورێکی کۆشکەکەدا دەرگای لەسەر خۆی داخست، ئاوێنەیەکی جادوویی تاکە پەنجەرەی بوو بۆ دونیای دەرەوە، ساڵ هاتو تێپەڕی، ئێمە هەموو هیوایەکمان لە دەستدا، کێ دەتوانێت دڕندەیەکی خۆشبوێت؟ لە شوێنێکی نزیک لە کۆشکەکە، لە گوندێکی خنجیلانەدا، کچێکی جوان دەژیا ناوی بێلا بوو، بێل حەزی لە خوێندنەوەی بەسەرهاتی چیرۆکی شوێنە دوورەکان بوو، حەزی لە خۆشی و شادی بوو لە ژیانیدا، هیوای خۆشی و شادی بۆ هەمووان



دەخواست، کەسێک بە ناوی گاستۆن کە زۆر خراپ و بەدکار بوو، نیازی خۆیی بە بێل ڕاگەیاندبوو کە ئارەزوو دەکات هاوسەرگیری لەگەڵدا بکات چونکە جوانترین کچی گوندەکە بوو، ئەو بایەخی نەدا بە گاستۆنی لووت بەرز و خۆ ویست، لەگەڵ ئەوەشدا پلانی تری هەبوو، مۆریس، باوکی بێل، داهێنەر بوو، لە زۆربەی داهێنانەکانیدا شکستی هێنابوو، مۆریس ڕۆژێک شەقێکی هەڵدا لە دوایین پرۆژەی و وتی: (ئیتر واز لەم شتە بێ کەڵکانە دەهێنم) بێلا بە پێکەنینەوە وتی: (تۆ هەمیشە وا دەڵێیت، بەڵام دەزانم لە پێشانگاکە تۆ خەڵاتی یەکەم دەبەیتەوە) بەهۆی هاندانەکەی بێڵەوە، مۆریس لە کۆتاییدا یەکێک لە داهێنانەکانی تەواو کرد. ئەو نیوەڕۆیە داهێنانەکەی کردە گالیسکەی دوای ئەسپەکەیەوە، ڕۆیشت بۆ پێشانگاکە، دوای چەند کاتژمێرێک، هێشتا بە ڕێگاوە بوون، مۆریس وتی: (بۆ ئەوەی زووتر بگەینە پێشانگاکە دەبێت بەناو دارستانەکەدا قەد بڕی بکەین) ڕێگەی ناو دارستانەکە تاریک و ترسناک بوو، پاشان فیلیپ گوێی لە دەنگی گورگەکان بوو و لە ترساندا بەرز بووە وە. مۆریس هاواری کرد: (وۆها، فیلیپ، وۆها!) بەڵام ئەسپەکە ترسا بوو و مۆریسی هەڵدایە خوارەوە، دەبوو بەپێ خۆی لەگورگەکان قوتار بکات، کاتێک هێزی لەبەر بڕا، قاچی لە دەرگا ژەنگاویەکەی کۆشکە سامناکەکە گیر بوو، لە دەرگەیدا بەڵام کەس وەڵامی نەدایەوە، پاشان بە وورياييەوە چووە کۆشکەکەوەوو وتی: (سڵاو، کەسی لێیە)؟ کاتژمێرێک



به مۆمدانە ئاڵتونییەکەی وت: (شش، بێدەنگ بە) مۆمدانەکە وتی: (ئۆه، بەزەییت هەبێت) دوایی هاتە دەرەوە و وتی: (بەخێربێیت بۆ ئێرە بەرێز) مۆریس سەری سوڕما کە بینیی مۆمدانێک قسە ئەکات. بەڵام کە لومییر پێی وت بە ئاگرەکە خۆی گەرم بکاتەوە، بە سوپاسگوزارییەوە چووە سەر کورسییەکی زەبەلاح، بە تێپەڕ بوونی کات، خاتوو پۆت لەگەڵ چیپی کوڕیدا گەیشتن، تاکو کوپێک چایی خۆش پێشکەشی مۆریس بکەن، تا ڕادەیەک دڵخۆش بوو، وتی: (چ خزمەتگوزارییەکە؟) دواتر، لەناکاو، دەرگاکە کرایەوە، سێبەری دڕندەکە کەوتە سەر ژوورەکە. هاواری کرد، وتی: (تۆ چی دەکەیت لێرە؟) دواتر دڕندەکە بە چنگە گەورەکانی گرتی و هەڵیدایە سوچێکی زیندانەکەوە. لەگوندەکە، لەو کاتەی بێڵا چاوەڕوانی گەڕانەوەی باوکی دەکرد، گاستۆن هاتە ژوورەوەو داوای لێکرد هاوسەرگیری لێ کرد، وتی: (بیری لێبکەرەوە، خانوویەکی ڕاو کردن، دوایین نێچیری من لەسەر ئاگر دەبرژێت، هاوسەرە خۆشەویستەکەم پێیەکانم بۆ دەشێلێت. دەزانیت کێ دەبێت بە هاوسەرم؟ بێل!) بێڵا نەیزانی چی بڵێت. دواتر پێی وت: (زۆر داوای لێبوردن دەکەم گاستۆن، بەڵام من شیاوی تۆ نیم) کاتێک ویستی لە دەستی هەڵبێت، گاستۆن لەسەر ڕێگاکە کەوتە ناو قوڕاوێکەوە، ڕێک لەبەردەم هەموو گوندنشینەکان، وتی: (بێڵا دەبێت بە هاوسەرم، هیچ هەڵەیەک لەو بارەیەوە



نەکەن) بەڵام بێڵا ئەو کاتە گوێی لێی نەبوو، لەو کاتەدا فیلیپ گەڕایەوە بۆ ناو کێڵگەکە، بێڵا هاواری کرد: (کوا باوکم، تۆ دەبێت بمبەیت بۆ لای!) ئەسپی ماندوو دووبارە بێڵی بەناو دارستانەکەدا برد، کاتێک کڵاوەکەی باوکی بینی لەبەردەم دەرگاکەدا زانیی دەبێت بچێتە ناو کۆشکەکەوە، لومییێر سەیرێکی بێڵی کرد، زانی بێل ئەو کەسە بوو کە چاوەڕێی بوون، کەسێک کە بتوانێت کاریگەری جادووەکە نەهێڵێت، کچەکەی برد بۆ لای باوکی، بێڵا هاواری کرد: (ئۆە، باوکە! دەبێت لێرە دەربازت بکەین) بەڵام دواتر دڕندەکە هاتە ژوورەوە، بێڵا لە دڕندەکە پارایەوەو وتی: (تکایە باوکم بهێنە دەرەوە، ئەو نەخۆشە) دڕندەکە وتی: (ئەو نەدەبوو سنوری ببەزاندایە، تۆ ناتوانیت هیچ شتێک بکەیت، ئەو زیندانیی منە) بێڵ وتی: (من بەرە لە بری باوکم) دڕندەکە وتی: (باشە دەبێت بەڵێن بدەیت بۆ هەتا هەتایە لێرە بمێنیتەوە) بێل لە ناچاریدا ڕازی بوو، دڕندەکە مۆریسی هەڵدایە ئەو دیوی دەرگاکەو بە گالیسکە جادووییەکەی گەڕانیەوە بۆ ماڵەوە، بێڵا خەمبار بوو کاتێک بینی باوکی بەجێی دەهێڵێت، تەنانەت نەیتوانی ماڵئاوایی لێ بکات. بەڵام زانیی دەبوو پارێزگاری لە بەڵێنەکەی بکات بۆ دڕندەکە، پاشان دۆڵابی ناو ژوورەکە پێی وت کە دڕندەکە هێندە کەسێکی خراپ نییە. خواردنی ناو کۆشکەکە بەتام بووە. ئیتر بێڵا هەوڵیدا باشترین شت بکات، لەوکاتەدا،



بەخێرایی مۆریس گەڕایەوە بۆ ناو گوندەکە، بە دەم هاوار کردنەوە چووە ژوورەوەو وتی: (دڕندەیەکی ترسناک بێلی لەکۆشکەکەیدا زیندانی کردووە) خەڵکی گوندەکە وایانزانی داهێنەرەکە شێت بووە، لە کاتێکدا ئەوانی تر بە مۆریس پێدەکەنین، گاستۆن هاوڕێکەی فڕدایە لاوە، وتی: (من پلانێکم هەیە) بیری لە دۆزینەوەی ڕێگە چارەیەک کردەوە بۆ ئەوەی بێلا ڕازی بکاتو هاوسەرگیری لەگەڵا بکات، لە کۆشکەکە، بێلا هەموو شوێنێکی ناو کۆشکەکەی لەبەردەمدا والابوو. دڕندەکە مۆڵەتی پێدابوو بڕوات بۆ هەر شوێنێک کە ئارەزوی دەکات ... بێجگە لە باڵی ڕۆژئاوا، باڵی ڕۆژئاوا هەموو هەستی بێلی داگیر کردبوو. کاتێک کەس ئاگای لێی نەبوو چووە ژوورەوە. ژوورێکی پیسی بینی کە پڕ بوو لە ئاوێنە و کەلوپەلی شکاو. تاکە شتی جوان، شتێکی زیندوو گوڵە جادووییەکە بوو، لەناو شووشەیەکی زەنگدا، خەریک بوو دەستی لێدەدا لەناکاو دڕندەکە پەیدا بوو هاواری کردو پێی وت: (بۆچی هاتوویت بۆ ئێرە؟ بڕۆ دەرەوە!) بێڵ ترسا، لومیێر و کۆگس وۆرس ئەویان بینی کە بەناو هۆڵەکاندا ڕایدەکرد، بەڵام نەیانتوانی بیوەستێنن، لە دەرگای پێشەوە ڕایکرد، زینەکەی خستە سەر پشتی فیلیپ و بەو شەوە سەهۆڵبەندانە ڕایکرد، کاتێک بێلا و فیلیپ بەناو دارستانەکەدا ڕێیان دەکرد، لە تاریکاییەکەدا چاوە زەردەکانی ئەو گورگە دڕندەکانیان بینی کە لە ناو دارستانەکەدا بوون. بەڵام کاتێک ویستیان خێراتر ڕابکەن، لغاوی فیلیپ کەوتە سەر لقی درەختێک. فیلیپ



لەترسا بەرز بووەوە، بێڵی فڕێدایە سەر زەوی. دەست بەجێ گورگەکان چواردەوریان گرتن، لەناکاو، دڕندە زەبەلاحەکە بە چنگەکانی یەکێک لە گورگەکانی گرت و هەڵیدا بۆ ئاسمان. دوای جەنگێکی سەخت، گورگەکان ڕایانکرد بۆ ناو دارستانەکە. بەڵام دڕندەکە بریندار بوو، بێڵ خەریکبوو بازی دەدایە سەر پشتی ئەسپەکە کە بینی دڕندەکە لە ئازاردا کەوتووە. بەڵام دوودڵ بوو لەوەی بڕوات بۆ لای، بێڵا یارمەتی دڕندەکەی دا بۆ ئەوەی بیگەڕێنێتەوە بۆ کۆشکەکە، چارەسەری برینەکانی کرد تاکو باشتر بوو. دواتر، بێڵا و دڕندەکە پێکەوە ئاسوودە بوونو کتێبیان دەخوێندەوە، پێکەوە نانیان دەخوارد، بەیەکەوە پیاسەیان دەکرد، کەل و پەلە جادووییەکان پێیان خۆش بوو کە بینییان ئەوان بوون بە هاوڕێ، یەکێکیان وتی: (ئەوە باش نییە؟!) لە کۆتاییدا، دڕندەکە ڕازی بوو بە قسەی شتە جادووییەکان بۆ ئەوەی جلی تازەی لەبەر بکەن، لومیێر ئامۆژگاری دڕندەکەی کرد و پێی وت: (ئەمشەو، کە کاتەکەی لەبار بوو دەبێت خۆشەویستی خۆتی بۆ دەرببڕیت) ئیتر ئەو شەوە، دوای خواردنی ژەمی ئێوارە، دڕندەکە بێڵی بردە ژووری ئاهەنگ گێڕانەکە و بەدەم گۆرانییەکی خۆشی خۆشەویستی پێکەوە سەمایان کرد، دڕندەکە وتی: (بێڵا، تۆ لێرە دڵخۆشیت لەگەڵ من؟) بێڵ وتی: (بەڵێ، بەڵام... ئەگەر تەنها بمتوانیایە بۆ ساتێک باوکم ببینم) دڕندەکە وتی: (ڕێگەیەک هەیە) ئاوێنە جادووییەکەی خۆی بۆ برد، کاتێک بێڵا سەیری ئاوێنەکەی کرد،



باوکی بینی بەمەبەستی گەڕان بەدوای ئەمدا و لەناو دارستانەکەدا ون بووەوەو دەلەرزێت. بێلا وتی: ئەو نەخۆشە! لەوە دەچێت بمرێت!) دڕندەکە وتی: (دەبێت تۆ بڕۆیت بۆ لای، من تۆ ئازاد دەکەم. بەڵام ئاوێنەکە ببە لەگەڵ خۆت، ئیتر تۆ هەمیشە ڕێگەیەکت هەیە بۆ ئەوەی سەیری دواوە بکەیت... منت لەبیر بێت) کۆگس وۆرس خەریک بوو ئەگریان وتیان: (چۆن هێشتت بڕوات؟) دڕندەکە وتی: (لەبەر ئەوەی خۆشم دەوێت) بەهۆی ئاوێنەکەوە، بێلا باوکی دۆزییەوە و بردییەوە بۆ ماڵەوە. باوکی لێی پرسی: (چۆن لەو دڕندە ترسناکە ڕزگارت بوو؟) بێڵ وتی: (ڕامنەکرد باوکە، ئەو ڕێگەی پێدام بڕۆم. ئەو کەمێک گۆڕاوە) ئەوکاتە، گاستۆن بەڕێوەبەری شێتخانەکەی ڕازی کردبوو تاکو مۆریس بگرێت. پلانێکی سادە بوو. ویستی بێلا بەوە ڕازی بکات ئەو تەنها کەسە کە بتوانێت باوکی بپارێزێت بەڵام بەو مەرجەی ڕازی بێت هاوسەرگیری لەگەڵدا بکات، گاستۆن وتی: (هەمووان دەزانن باوکی ئەو شێتە، شتی سەیر دەربارەی دڕندە زەبەلاحەکە باس دەکات. بەڵام بێلا ناتوانێت هیچ بکات بۆ ئەوەی بیپارێزێت) کاتێک گاستۆن و بەڕێوەبەر گەیشتن، بێڵ چواردەوری درابوو بە گوندنشینەکان، ئاوێنە جادوویەکەی دەرهێنا و وێنەی دڕندەکەی پیشاندان، وتی: (باوکی من شێت نییە! دڕندەکە ڕاستییە، بەڵام ئەویش میهرەبانە) گاستۆن ئەوەی زانی کە بێلا هەستی هەیە بۆ دڕندەکە. بە تووڕەییەوە ئاوێنە جادوویەکەی لێسەند، گاستۆن بە خەڵکەکەی وت: (ئەویش



شێتە وەکو باوکە پیرەکەی! دڕندەکە منداڵەکانتان دەخوات. دەڵێم با بیکوژین!) ئیتر خەڵکە تووڕەکە بەناو دارستانو باوبۆراندا دوای گاستۆن کەوتن بۆ کۆشکی دڕندەکە، کەلوپەلە جادووییەکان لە پەنجەرەی کۆشکەکەوە قەرەباڵغیەکەیان بینی، خۆیان بۆ بەرگری ئامادەکرد. گوندنشینەکان لەدەرگای کۆشکەکەیان دەدا، سوپایەکی کەلوپەلی تووڕە ئامادە بوون بۆیان، لومییر سەرکردایەتی هێرشەکەی کرد و وتی: (ئێستا!) یەکسەر، چەتاڵ و گسک و کەلوپەلو هەموو شتەکان خۆیان هەڵدا بۆ خەڵکی گوندەکە، بەڵام دڕندەکە، دڵنیا بوو کە بۆ هەمیشە بێلی لە دەستداوە، هیچ دڵێکی نەبوو بۆ شەڕ کردن. خاتوو پۆتس لێی پرسی: (گەورەم، ئێمە دەبێت چی بکەین؟) دڕندەکە وتی: (ئێستا ئەوە هیچ کێشە نییە. لێیان گەڕێن با بێن) کاتێک گاستۆن هاتە ژوورەکەیەوە، دڕندەکە تەنانەت هەوڵی نەدا بەرگری لە خۆی بکات، کاتێک بێلا دوای چەند چرکەیەک گەیشت، ئەوەی بینی کە گاستۆن دڕندەکەی بردووەتە سەر لێواری کۆشکەکە. هاواری کرد: (نەخێر!) دەنگی بێلا وای لە دڕندەکە کرد کاردانەوەی هەبێت. ملی گاستۆنی گرتو بە لێواری کۆشکەکەدا شۆڕی کردەوە، گاستۆن لێی پاڕایەوە: (بهێڵە بڕۆم! هیچ ناکەم!) دڕندەکە زۆر تووڕە بوو بەڵام دواتر زانیی لە دڵیدا دڕندە نەبووە گاستۆنی هەڵگرتەوە بۆ ناو کۆشکەکە، سەیری بێلی کرد، هاتبووە سەرەوە بۆ ئەوەی ئەو بدۆزێتەوە، بەڵام کاتێک دڕندەکە ڕۆیشت بۆ ئەوەی بێل لە ئامێز بگرێت، گاستۆن چەقۆیەکی درێژی



ڕاوکردنی لە پێڵاوەکەی دەرهێنا... لە دواوە کردی بە دڕندەکەدا، دڕندەکە بەدەم ئازارەوە هاواری کرد. گاستۆن بە ترسەوە هەنگاوی نا بۆ دواوە، لەسەر لێوارەکە قاچی هەڵخلیسکاو کەوتە خوارەوە، دڕندەکە بە سەختی بریندار بوو. بێڵا ڕایکرد بۆ لای و باوەشی پێدا کرد. دڕندەکە پێی وت: (تۆ هاتیتەوە، هیچ نەبێت توانیم بۆ دوایین جار بتبینمەوە) بێڵ بە فرمێسکەوە وتی: (بەو شێوەیە قسە مەکە. تۆ باش دەبیت) لە ژووری دڕندەکە، دوایین پەڕەی گوڵەکە خەریکبوو هەڵدەوەری، بێڵا نزیک بووەوە بۆ ئەوەی ماچی بکات کە دوایین پەڕەی گوڵەکە وەری. بە گریانەوە وتی: (نەخێر! تکایە بەجێم مەهێڵە من خۆشم دەوێیت) لە پڕ کاریگەری جادووییەکە نەما، دڕندەکە هەستایەوە و گۆڕا بۆ شێوەکەی پێشوی، شازادە وتی: (بێڵا، ئەوە منم) بێڵا باوەشی بەشازادەدا کرد. کاتێک ماچی یەکتریان کرد، جادووەکە ئاسمانی داپۆشی. بەزوویی، لومییێر، کۆگس ۆرس، خاتوو پۆتس و چیپو هەموو کەلوپەلە جادوییەکان گۆڕان بۆ شێوە مرۆڤانەییەکەیان، ئەو شەوە، کۆشکەکە پڕبوو لە خۆشەویستی بێڵا و شازادە سەمایان دەکرد، چاویان لەسەر یەکتر بوو. کۆشکەکە دووبارە ژیانی بۆ گەڕایەوە.

# بەسەرهاتی سۆپەرمان



سۆپەرمان پیاوێکی چاکەکار بوو، ژیانی خۆی تەرخان کردبوو بۆ خزمەتکردن و بەهاناوە چونی مرۆڤکان، ناوی ڕاستەقینەی کلارابوو، لەبەر خێراییەکەی و ئازایەکەی پێیان دەوت سۆپەرمان، ڕۆژێکیان سۆپەرمان بە پەلە لەکارەکەی چووە دەروە، هاوڕێکەی هاواری لێ کرد، بۆچی هێندە بە پەلەیت؟ سۆپەرمان وەلامی دایەوەو وتی: من دەچم بۆ ماڵە نهێنیەکەی خۆم، ماڵە نهێنیەکەی سۆپەرمان بیریتی بوو قەلایەکی چۆڵ، سۆپەرمان بەهاوڕێکەی ووت: بەم کلیلە دەرگاکە ئەکەمەوە، سۆپەرمان کلیلەکەی کرد بە دەرگاکەدا، بەهێزە مەزنەکەی توانی دەرگاکە بکاتەوە، سۆپەرمان و هاوڕێکەی چوونە ناو قەلاکە، سۆپەرمان هەناسە مەزنەکەی بەکارهێنا بۆ داخستنی دەرگاکە، هاوڕێکەی ووتی: ئەمە سەرسوڕهێنەرە، هاوڕێکەی ووتی: ئەم دووکەسە کێن وێنەت هەڵواسیون؟ سۆپەرمان ولامی دایەوە وتی: ئەوە باوکمە، هاوڕێکەی لە سۆپەرمانی پرسی، ئەی ئەو هێزە بێ سنورەی هەتە لە دایک و باوکتەوە بۆت ماوەتەوە؟ سۆپەرمان وتی: خودای گەورە بەتیشکی زەردی هەتاو ئەو هێزە مەزنەی پێ بەخشیم بۆ چاکە کردن لەگەڵ خەڵکیدا، تەنانەت کاتێک کوڕێکی منداڵیش بووم توانای هەڵگرتنی لۆریەکی بار هەڵگرم هەبوو!، لویسی هاوڕێی سەری سوڕما لەوەی بیستی، ووتی: ئەتوانی چیتر بکەیت؟ سۆپەرمان وڵامیدایەوە: ئەتوانم لەودیوی شتەکانەوە ببینم بەهۆی تیشکی





سینی، وەهیچ شتێک ناتوانێت ئازارم بدات! لویسی هاوڕێی وتی: هیچ شتێک!؟ سۆپەرۆمان ووتی: تەنها ڕۆبۆتەکانیش ناتوانن هێزم لاوازبکەن، لەناکاو لەناو ماڵەکەی سۆپەرماندا ووریاکەرەوەکە لێیدا، پیاوێکی تووڕەی شەڕەنگێز لەسەر شاشەی کۆمپیوتەرەکە دەرکەوتو وتی: من حوکمی جیهان دەکەم، دەبینن چی ڕوودەدات من هەموو هێزەکان ئەگرمە دەست، سۆپەرمان وتی: ئەستێرەی زەوی لە مەترسیدایە، ئەم پیاوە شەڕەنگێزە ئەیەوێت ئەستێرەکەمان تێکبدات، سۆپەرمانو لویسی هاوڕێی لە قەڵاکە دەرچوون بۆ دانانی سنورێک بۆ نەخشەکانی پیاوە دڕندەکە، پیاوە دڕندەکە هەستا بە تەقاندنەوەی بینایەک وەک یەکەم کاری، هاواری دەکرد هەموو شارەکان کاول دەکەم، من ڕقم لە مرۆڤایەتییە، کاتێک سۆپەرمان گەیشت وتی: بیناکان خەڵکی بێتاوانی تێدایە، بۆ زیانیان پێبگات؟ پیاوە تووڕەکە هاواری کرد: ئەستێرەی زەوی تەنها بۆ منە، لەو کاتەدا بینایەکی دیکەی وێران کرد، وەختەبوو بەردێک بکەوێت بەسەر هاوڕێکەی سۆپەرماندا، بەڵام سوپەرمان بێ زیان دووری خستەوە، سوپەرمان وتی: دەتوانم تیشکەکەی پیاوە تووڕەکە تێک بشکێنم بەهۆی هێزە مەزنەکەمەوە، لەچاوی سوپەرمانەوە تیشکێکی سوور دەرکەوت و چەکەکانی پیاوە تووڕەکەی وێران کرد، سوپەرمان توانی سنورێک بۆ پیلانەکانی پیاوە دڕندەکە دابنێت و پێی وت: ئێستا هەڕەشەکانت کۆتایی هات، سۆپەرمان پاوە دڕندەکەی گرت و ڕادەستی پیاوانی پۆلیسی کرد، بۆ ئەوەی سزای یاسایی بدرێت.





# سوپەرمان و پیاوە خراپەکارەکە

سۆپەرمان پیاوێکی بەهێزو چاکە کار بوو، بەردەوام هەوڵی دەدا هاوکاری ئەو کەسانە بکات کە پێویستیان پێبوو، هەمیشە ژیانی خۆی دەخستە مەترسییەوە بۆ ئازادکردنی ژیانی کەسێکی دی، سەرلەبەیانی رۆژێک سۆپەرمان بەناو شاردا بەهێمنی دەڕۆیشت، شەقامەکان تازە قەرەباڵغ دەبوون، سۆپەرمان گوێی لە پشیلەیەک بوو لەسەر دارێک ئەی میاواند، وەک ئەوەی پێویستی بەهاوکاری بێت، سۆپەرمان سەرکەوت بۆ ڕزگارکردنی، سوپەرمان خێرا جلەکانی گۆڕی و لاشەی گۆڕا بۆ پیاوە بەهیزو خێراکە، پشیلەکە لەسەر دارێک گیری خواردبوو، سوپەرمان پەلامایدا رزگاری کات، بەڵام کەسێکی دیکە هەبوو پێش ئەو، لەژێردارەکە کابرایەکی نەناسراو وەستابوو، پیاوێکی شەڕەنگێز و خراپە کار بوو، دەیویست بیسەلمێنێت کە ئەو لە سۆپەرمان باشترو بەهێزترە، ئەو پیاوە بەرامبەر سوپەرمان هاواریکرد: پشیلەکە دارەکە دەترسێنێت، پێویستە دارەکە رزگارکەم، دارەکەی لەزەوی هەڵکێشا و فڕێیدا، پیاوێکی بەهێزبوو بەڵام گەمژەو بێ کەڵک بوو، هێزەکە لە کاری چاکە کردندا بەکار نەدەهێنا، پیاوە خراپەکە ئەو ناوەی بەجێهێشت و بەرەو ئاسمان فڕی، سوپەرمان ووتی: پێویستە بیگەمێ بۆ ئەوەی دڵنیابم کەسی دیکە ئازار نادات، سوپەرمان کەوتە شوێن پیاوە خراپەکارەکەوە، هەردوکیان گەیشتنە کۆگایەک گڕی گرتبوو دەسوتا، پیاوە خراپەکە وتی: هاوکاری پیاوانی ئاگر کوژانەوە ئەکەم بۆ کوژاندنەوەی ئاگرەکە، ئۆتۆمبیلی ئاگر کوژێنەوەکەی لەسەر سەری



هەڵگرت فرێدایە سەر ئاگرەکەو تەقیەوو سووتا، پیاوە خراپەکە وتی: ئەرکەکەی خۆم ئەنجامدا، دوبارە فریەوە بەهەوادا، بەڵام ئاگرەکە هێشتا هەردەسووتا و ئۆتۆمبیلەکەش بەتەواوەتی لەناوو چوو، ناچار سۆپەرمان ئاگرەکەی کوژاندەوە، بەدەرکردنی هەوایەیەکی سەهۆڵاوی لە دەمیەوە، سوپەرمان گوێی لەدەنگێکەوە بوو داوای یارمەتی ئەکرد، بەلەمێک لە ئاوەکەدا نغرۆ دەبوو ژێر ئاو دەکەوت، هیچ کات نیە لەدەست بدرێت، پێویستە سوپەرمان پێش پیاوە خراپەکە بگات، بەڵام لە بەدبەختی پیاوە خراپەکە لەوێ بوو وتی: کێشە نیە، ئاوەکە زیان بەبەلەمەکە ئەگەیەنێت، بۆیە پێویستە ئاوەکە راگرم، پیاوە خراپەکە خۆی کێشا بە کەناری دەریاکەدا، پارچە بەردو ئاسن بەئاسماندا بڵاو بویەوە و دەکەوتە ناو ئاوەکە، سوپەرمان بەلەمەکەی هەڵگرت و گواستیەوە بۆ شوێنێکی ئارام، ئاوەکە دەستی بەزیادبون کرد وەختەبوو لافاوێکی گەورە هەستێت لەشاردا، بەخێرایی‌و هێزە مەزنەکەی سوپەرمان توانی ئاسن‌و بەردەکان کە بەر ئاوەکەیان گرتبوو بگوازێتەوە، دووبارە ئاوەکە دەستی بە نیشتنەوە کرد، سوپەرمان ووتی: ئێستا دووبارە پردەکە دروست دەکەمەوە، سوپەرمان تیشکە گەرمەکەی

بەکارهێنا بۆ لەحیمکردنی پردەکە دووبارە وەک خۆی، پیاوە خراپەکە تورە بوو لە سوپەرمان وهاواری کرد: چی دەکەیت؟ من پاڵەوانم، نەک تۆ، سوپەرمان ڕووی کردە پیاوە خراپەکەو وتی: ناتوانیت لێرە لەسەر زەوی بمێنیتەوە، پێویستە بگەڕێیتەوە بۆ شوێنی خۆت، پیاوە خراپەکە بە هێزێکی زۆرەوە بەقاچ کێشای بەزەویدا، زەویەکە دەلەرییەوە، هاواریکرد ووتی: نا، تۆ پێویستە ئەستێرەی زەویی جێ بهێڵیت، پیاوە خراپەکە پەیکەرێکی گرتە سوپەرمان، لەچاویەوە تیشکێکی بەستووی دەرکرد، سوپەرمان هەموو گیانی بە بەفر داپۆشرا، پیاوە خراپەکە پێکەنی ووتی: (هاهاهاهاها) بەڵام سوپەرمان هەموو هێزە سەرسوڕهێنەرەکەی بەکار هێناو رزگاری بوو لە سەهۆڵەکە، سوپەرمان بە پیاوە خراپەکەی ووت: سەیرکە چ ئاژاوەیەکت ناوەتەوە! ناتوانیت هیچ شتێک باشکەیت لەسەر زەوی بکەیت، لەناکاو پیاوە خراپەکە بێدەنگ بوو، زانی سوپەرمان ڕاست دەکات، پیاوە خراپەکە لەسەر زەوی ماندوبوو، هەستیکرد پێویستە بگەڕێتەوە بۆ جیهانی خۆی، کە دەتوانێت لەوێ سوود بەخش بێت، بۆیە پیاوە خراپەکە گەڕایەوە بۆ جیهانی خۆی.





# سپایدەرمان و دکتۆر ئۆکتوبەس

پیتەر پارکەر گەنجێکی ئاسایی بوو تا ئەو کاتەی کە لەلایەن جاڵجاڵۆکەیەکەوە گازی لێگیرا، لەوە بەدواوە پیتەر هەمان هێز و توانای جاڵجاڵۆکەی وەرگرت لە هاوێشتنی تۆڕی جاڵجاڵۆکە بۆیە بڕیاری دا ئەو هێزەی لە دژی ستەمکارە دڕندەکان بەکاربهێنێت و یارمەتی بێدەسەڵاتەکانی پێبدات بۆیە وەکو سپایدەرمان لەناو خەڵکیدا ناسێنرا، لە هەمان کاتدا وێنەگری رۆژنامەی دەیلی بەگڵ بوو. یەکێک لە هەرە پیاوە دڕندەکان پیاوێک بوو کە بە دکتۆر ئۆکتوبەس ناوبانگی دەرکرد بوو کە چوار دەستی ئاسنی هەبوو ، دکتۆر ئۆکتوبەس پێشتر زانایەکی زۆر زیرەک بوو بەڵام رۆژێکیان لە تاقیگەکەیدا تەقینەوەیەک روویدا دوای ئەو تەقینەوەیە ئەو گۆرانکاریە لە جەستەیدا دروست بوو و بوو بە پیاوێکی دڕندە، رۆژێکیان لەو کاتەی چەند ئەکتەرێک رۆڵی سپایدەرمان و دکتۆر ئۆکتوبەس یان لەسەر باڵە خانەیەکی بەرز دەگێرا جاکسۆنی تەمەن شەش ساڵ زۆر تامەزرۆ بوو بیان بینێت ئەو کاتەی ئەکتەرەکان رۆڵ دەگێرن بۆیە چوو تاکو بیانبینێت، لەوێ ستافی رووناکی و کامێرا و دەرهێنەری لێبوو، ئەکتەرەکان رۆڵی سپایدەرمانیان دەگێرا، لەوێ پیتەری لێبوو کە خەریکی وێنە گرتن بوو بۆ رۆژنامەی دەیلی بەگڵ، هەر لەوێ کەسێکی دەم و چاو گرژی تورەی لێبوو



ناوی جەیمسۆن بوو، جەیمسۆن سەرنوسەری ڕۆژنامەکە بوو، لە جاکسۆن توڕە بوو و ووتی: کوڕە لێرە دوورکەوە نابینی ئەوان ڕۆڵ دەبینن؟ پیتەر بە ڕوویەکی خۆشەوە رووی کردە جاکسۆن و چرپاندی بە گوێیدا، ئەوان خەریکن ڕۆڵی سپایدەرمان و دکتۆر ئۆکتوپەس دەبینن منیش خەریکم وێنەیان دەگرم بۆ ڕۆژنامەی دەیلی گێڵ، جاکسۆن زۆری حەزی دەکرد هاورێکانی لەگەڵی دابوایەن تا ئەوانیش تەماشایان بکردایە و بە پیتەری ووت: خۆزگە بیلی و دیلۆن و جۆش لێرە بونایە. لەڕاستیدا جەیمسۆن ڕقی لە سپایدەرمان بوو بەڵام هاتبوو تا ببینی کە ئایا ئەکتەرەکان بە باشی ڕۆڵ دەبینن یان نا، دەرهێنەرەکە هاواری کرد تۆمارکردن تەواو با دەست بکەین بە دیمەنێکی نوێ، لەم دیمەنەدا سپایدەرمان و دکتۆر ئۆکتبوپەس ڕووبەڕووی یەکتری دەبنەوە و ئاماژەی دانێ کە دەست پێبکەن، جاکسۆن بینی ئەو کەسەی ڕۆڵی سپایدەرمان دەبینی دکتۆر ئۆکتوپەسی دا بە زەویدا، لە ناکاو دیمەنەکان بوون بە ڕاستی دکتۆر ئۆکتوپەس بە تورەیەوە خۆی کرد بە ناو خەڵکەکەدا و نەڕاندی و ووتی: چۆن توانیتان ڕۆڵی ژیانی من ببینن بێ ئەوەی پرسم پێبکەن؟ لە ژیانی ڕاستەقینەمدا مێوولە بێ بەهام کوشتوە وەکو سپایدەر مان، ئەو ئەکتەرەی کە ڕۆڵی سپایدەرمانی دەبینی ووتی: ئەوە چی ڕوونەدا لێرە؟ ئەوە دەقی سیناریۆکەی من نیە، دوای ئەوەی کامێراکەی پیتەر کەوتە زەوی بە بێتاقەتیەوە ووتی: هەلی زێرینی گرتنی وێنەکان بۆ ڕۆژنامەکەم لە دەست چوو، بەڵام دواتر بیری کردەوە و ووتی ئێستا کاتی ئەوەیە وەکو سپایدەرمان دەربکەوم، لەسەرووی




قەرەبالغیەکەوە سپیایدەرمان تۆڕەکە هەڵدا تا رزگاری ببێت، واو ئێستا دوو سپایدەرمانمان هەیە، جاکسۆن بە جەیمسۆنی ووت: جەیمسۆن بە تورەییەوە وەڵامی دایەوە، تەنها یەک سپایدەرمان بەسە، ئەکتەر و دەرهێنەرەکە رایانکرد ئەو کاتەی سپایدەرمان لەبەردەم دکتۆر ئۆکتوپەس دا نیشتەوە، سپایدەرمان یەکسەر تۆڕی جاڵجاڵۆکەکەی لە قاچی دکتۆر ئۆکتوپەس ئاڵاند، بەبێ ئەوەی ووشەیەک بڵێت تۆڕەکانی پچراند، جاکسۆن ووتی ئەوا خەریکە فلمێکی راستەقینە تۆماردەکەن رووی کردە جەیمسۆن و ووتی پێیوستە یارمەتی سپایدەرمان بدەین دکتۆر ئۆکتوپەس لەناو بەرێت، بەڵام جەیسۆن ووتی ئەو هیچ نیە لە چاو هێزی تۆڕەکانی سپایدەرمان، دکتۆر ئۆکتوپەس قسەکانی جەیمسۆنی بەدڵ نەبوو بە دەستەکانی بەرزی کردەوە و پێی ووت: پێت وایە سپایدەرمان لەمن بەهێتزترە؟ ئێستا هێزی خۆمت پێنیشان ئەدەم



وات لێئەکەم بیرکردنەوەت بگۆڕی بەرامبەرم، بۆیە بەرزی کردەوە و بەرەو دیوارەکە فرێی دا بەڵام پێش ئەوەی بکەوێتە سەر زەوی سپایدەرمان بە تۆڕەکانی گرتیەوە و نەهێشت بەر زەوی بکەوێت بە داری ئاڵایەکدا بەستیەوە و رووی کردە دکتۆر ئۆکتوبەس، جاکسۆن کە جەیسۆنی بینی بە دارەکەوە پێی ووت نیگەران مەبە دڵنیام سوپەرمان رزگارت ئەکات. سپایدەرمان خۆی بەرەو رووی دکتۆر ئۆکتوبەس هەڵدا و پەلاماری دا بەڵام دکتۆر ئۆکتوبەس بە دەستەکانی سپایدەرمانی بە توندی گرت و خەریک بوو لە باڵەخانەکەوە بیخاتە خوارەوە، لەو لاوە جاکسۆن ویستی یارمەتی سپایدەرمان بدات بۆیە تۆپەڵە تۆری جاڵجاڵۆکە لە و نزیکانە کەوتبوو فرێی دایە سەر دەم و چاوی دکتۆر ئۆکتوبەس و بە چاوی خۆی نەبینی و دەستی لە سپایدەرمان بەردا. دکتۆر ئۆکتوبەس کوێرانە دەستی دەوەشاند و پێشی خۆی نەدەبینی ووتی با ئەم تۆرە لە دەموچاوم بکەمەوە ئەوا خۆم ئەزانم چی لە خۆت و هاورێکەت ئەکەم. رات چیە سەبارەت چەند دەستێکی تر؟ سپایدەرمان بە دکتۆر ئۆکتبوبەسی ووت و ئەو دەستانەی کە لە ئەکتەرەکە بە جێمابوو بە تۆرەکە بەستی بە دکتۆر ئۆکتبوبەس ەوە تا وای لێکرد نەتوانێ جوڵە بکات و لەسەر زەویەکە کەوت، جاکسۆن ووتی کەسێکی تر هەیە پێویستی بە یارمەتی تۆ هەیە ئەویش بەرێز جەیمسۆنە. جەیمسۆن لەو بەرزیەوە هاواری دەکرد یارمەتی، یارمەتی سپایدەرمان پێویستە یارمەتیم بدەیت، سپایدەرمان بە پێکەنینەوە رووی کردە جاکسۆن و پێی ووت پێت چۆنە جەیمسۆن لەو بەرزیە سەرخەوێک بشکێنێ؟ پێت باشە یارمەتی بدەین کە پێی نەوتین بەیارمەتیان.

# چیرۆکی فڕۆکەکان

(دەستی) فڕۆکەیەکی بچووکی کشتوکاڵی بوو، کاری چاندنی تۆوی دانەوێڵە و دەرمانی کشت و کاڵی بوو، بەڵام (دەستی) خەونێکە گەورەی هەبوو ئەیویست ببێت بە خێراترین فرۆکە لە جیهاندا. پێشبڕکێ تاکە شتێک بوو کە ئەو بیری لێدەکردەوە، تەنانەت لە کاتی ئیشکردنیشا هەربیری لای پێشبڕکێبوو، (دەستی) هەموو ڕۆژێک لەدوای کارکردن ڕاهێنانی دەکرد، بەردەوام دەفڕی فڕین بەسەر کێڵگەکاندا بەسەر ماڵەکەی خۆیدا، وردە وردە پێشبڕکێی بەناوبانگی (پاڵەوانی فڕۆکەکان) نزیک دەبۆوە لە دەست پێکردن. چەک کە تەنکەرێک بوو باشترین هاوڕێی (دەستی) بوو، وە ڕاهێنەریشی بوو، کە بە ئامێری بێتەل لەسەر زەویەوە قسەیی لەگەڵ (دەستی) دەکردوو بەردەوام زانیاری پێدەداو ڕێنوێنی (دەستی) دەکرد بۆ گۆڕینی ئاراستەو جوڵەکانی. شەوێکیان لەگەڵ (دەستی) بەیەکەوە سەیری تەلەفیزیۆنیان دەکرد کە بەرنامەیەک بوو لەسەر پێشبڕکێی فڕۆکەکان. (چەکی) تەنکەر لەم کاتەدا کە سەیری تەلەفیزیۆنیان دەکرد هەستی کرد کە (دەستی) هاوڕێی پێویستی بە فڕۆکەیەکە بۆ ڕاهێنان پێکردنی نەوەک تەنکەرێکی وەک ئەو. چەک پێشنیاری بۆ (سکیپەر) کرد کە جەنگاوەرێکی دەریای کۆن و خاوەن ئەزموون بوو. چەک و (دەستی) چوون بۆلای ساباتی فڕۆکە وەستانی سکیپەر، (دەستی) داوای لێکرد کە ڕاهێنانی پێبکات چوونکە زۆر پێویستی بە هاوکاری ئەوە. بەڵام سکیپەر زۆر بە توڕەییەوە ووتی: بگەڕێوە



ماڵەوە منداڵ، سکیپەر بە هیچ شێوەیەک ڕازی نەبوو ڕاهێنان بە (دەستی) بکات، وە بەتوندی دەرگاکەی بەسەر (دەستی) داخس. بە ناچاری چەکی هاوڕێب بەردەوام بوو لە ڕاهێنانی (دەستی) و هەموو توانی خۆی بۆ خستە کار، کاتی پاڵاوتن بۆ پێشبڕکێکە هات. (دەستی) جیاواز بوو لە هەموو فڕۆکەکانی تر ئەوە بۆیەکەمجاربوو کە فڕۆکەیەکی بچوکە کشتوکاڵی بچێتە پێشبڕکێیەکی واوە. یەکێک لە فڕۆکەکان کە ناوی (ڕیسلینگە) بوو سێ جار نازناوەکەی بەدەست هێنابوو، ووتی: (دەستی) هیچ هەلێکی بۆ بردنەوە نییە. سەرە گەیستە (دەستی) بۆ ئەوەی خۆی تاقی بکاتەوە، هەموو فڕۆکەکانی تر کە هەواداربوون لەوێ دەستیان کرد بە پێکەنین بە (دەستی) بەڵام (دەستی) زۆر بەباشی و زانایانە دەستی کرد بە فڕین کارەکەی زۆر بەباشی ئەنجامدا، بەڵام کەمێک بەترس و هیواشی کۆتایی بەکارەکەی هێنا. دەستی گەڕایەوە ماڵەوەو بڕیاریدا واز لە خەونەکەی بهێنێت و چیدی بەژداری پێشبڕکێ نەکات. بەڵام چەند ڕۆژێک دواتر ڕێخەری پێشبڕکێکە هات بۆلای (دەستی) بۆ ماڵەوەو کە ئەو فڕۆکەیەی لە پێش (دەستی) بووەوازی لە پێشبڕکێکە هێناوە وە تۆ دەتوانی ئێستا لە شوێنی ئەو بەشداری بکەیت. هەموان زۆر بەمە دڵخۆش بوون تەنانەت سکیپەریش ڕازی بوو ببێت بە ڕاهێنەری (دەستی) ڕۆژێکیان (دەستی) نهێنیەکی گەورەی ژیانی خۆی بۆ ڕاهێنەرەکەی باسکرد کە ئەو زۆر زۆر لە بەرزی دەترسێت, سکیپەریش پلانێکی ژیرانەی دانا بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیەو ڕەوانەوەی ترسەکەی (دەستی) لە بەرزایی. سکیپەر پلانێکی دانا بۆ چارەسەرکردنی ترسەکەو (دەستی) فێرکرد کەچۆن بەسەر هێڵی ئاسمانیدا بفڕێت هەموو ڕۆژێک، بە هەوڵدانێکی زۆر بە چەند ڕژانێکی زۆر دواتر (دەستی)



توانی لە بەرزایدا بەباشی فێری فڕین ببێت و ترسەکەشی نەمێنێت. پێشبڕکێکە لە شاری نیۆرک لە وڵاتی ئەمریکا ئەنجام دەدرا، دەستی زۆر دڵخۆشبوو لەگەڵ پاڵەوانانی فڕۆکەکاندادەبێت. هەوڵیدا لەگەڵ پێشبڕکێکارێکی بەریتانی گفتوگۆبکات کە ناوی (بووڵ دۆک) بوو, براوەی پێشبڕکێی کیشوەری ئەوروپا بوو، بەڵ لەخۆبای بوو هیچ گرنگی بە (دەستی) نەدا، بە خۆی ووت: هەموو فڕۆکەیەک باشترین هاوڕێی خۆیەتی. سکیپەر لەوێبوو بۆ هاندانی (دەستی) هاواری لە دەستی کردو وتی: هیوای بە ختێکی باشت بۆ دەخوازم کوڕە ئازاکەی گێلگە ئەی باشترین هاوڕێی سروشت. (دەستی) چاوی بە «ئێڵ» کەوت کە پاڵەوانی وولاتی مەکسیکبوو، ئەویش یەکەم جار بوو لەم پاڵەوانیەتیەدا بەشداری بکات، لەگەڵ دەستی بوون بە هاوڕێ و بەدەستی ووت: لە ئاسماندا یەک دەبینینەوە، بە هیوای بەختێکی باش. بۆ بەیانی ڕێخەری پێشبڕکێکە ئاماژەی بۆ ناردنی یەکەم بەشی پێشبڕکێکە کرد، کە یەکەم بەشی پێشبڕکێکە فڕین دەبێت بەسەر ئۆقیانوسی ئەتڵەسی بەرەو وڵاتی (ئایسلاند) ، هەر لەسەرەتاوە (دەستی) بەگڕوتینێکی باشەوە دەستی پێکرد، سور بوو لەسەر بەردەوامی لە پێشبڕکێکەدا، بەڵام گەردەلولێکی تەرزاوی بەهێز بارودۆخەکەی خراپکرد. فڕۆکەکان بەناو گەردەلولەکەدا فڕین بەسەر ئۆقیانوسی ئەتڵەسیدا، هەموو فڕۆکەکان توانیان گەردەلولەکە تێپەڕێنن و بەسەر گەردەلووکەکەدا بفڕن، بەڵام (دەستی) هێشتا لە بەرزایی دەترسا، بۆیە ڕێک بەناو گەردەلولەکەدا دەفڕی، (دەستی) خەریک بوو خۆی بەشاخێکی سەهۆڵیندا بکێشێت، (دەستی) بە لەرزوترسێکی زۆرەوە گەیشتە



ئایسلاندا بەڵام یەک کاتژمێری تەواو دوای فڕۆکەکانی تر، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە (دەستی) ئاخر فڕۆکە دەبێت کە سبەینێ بفڕێت. بەشی دووەمی پێشبڕکێکە بریتی بوو لە فڕین بۆ وڵاتی ئەڵمانیا بەشەو، لەکاتی گەشتەکەدا «بووڵ دۆک» بەنزینی لێ دەڕۆیشت، (دەستی) بڕیاریدا کە نەهێڵێت «بووڵ دۆک» تێک بشکێت، هاوکاری کدر. «بووڵ دۆک» زۆر سپاس گوزاری (دەستی) بوو کە ژیانی ڕزگارکرد. فڕۆکەکان هەموویان ستایشی دەستیان کرد، پێیان ووت: کە ئەو پاڵەوان بووە، (دەستی) زۆر بەناوبانگ بوو لە پێشبڕکێکەدا، «بۆیە ڕیپسلینگەر» زۆر توڕەبوو کە فڕۆکەیەکی کشتوکاڵی ئەوەندە گرنگی پێدەدرێت، خۆی و دەستەکەی بڕیاریان دا (دەستی) لە پێشبڕکێکە دەربکەن. لەبەشی سێهەمی پاڵەوانیەتیەکەدا (دەستی) ئەوەندە ئاستی پێشکەوت توانی پێشی زۆربەی فڕۆکەکان بداتەوە لە فڕین بەسەر زنجیرە چیاکانی وڵاتی هندستاندا. فڕین بەنزمی و شەپۆلدان و تەقەڵ لێدان بەدەورو بەری خۆیدا پیشەی (دەستی) خۆی بوو، لە زنجیرە چیاکانی هیمالایەوە هەتا وڵاتی نیپاڵ (دەستی) لە کۆتا فڕۆکەوە بوو بەیەکەم فڕۆکە، بوو بە ئەستێرەی پێشبڕکێکە، بە ملیۆنان بارهەڵگر لەسەرتاسەری جیهانەوە چاودێری بەرو پێشچوونەکانیان دەکرد و هانی دەستیان دەدا بۆ پێشبڕکێی چین و شەنگەهای. کاتێک کاتی گەشتکردن هات بەسەر دەریای هێمندا، «سکیپەر» لە ڕێگای جیهازی بێەلی ڕادیوە هەندێک ڕێنمایی (دەستی) کردو پێی ووت: ئەگەر ئەوانی ترت لێ وونبوو بەردەوامبە لە



فڕین بەشێوەیەک کە هەمیشە خۆر لەلای ڕاستت بێت. دۆنی فیتەر بە (دەستی) ووت: هەمویان لە مەکسیک چاویان بە (دەستی) دەکەوێت، بەبیستی ئەم هەواڵە (دەستی) زۆر دڵخۆش بوو، بۆبەیانی فڕۆکەکان هەموویان بەناو هەورەکاندا دەفڕین دەستیش یەکێک بوو لەو فڕۆکانەو هیچ ترس و دڵەڕاوکێیەکی لە بەرزایی ئاسمان نەمابوو لەناو تەم و مژەکەدا دەفڕین، کاتێک بەسەر دەریای هێمندا دەفڕین، تیمەکەی ڕیپسلینگەر ئارپاڵەکەی دەستیان شکاند، بەبێ ئەوە دەستی لەدۆڕان نزیک دەبووەوەو ئاراستەکەی دەگۆڕا، بەڵام (دەستی) ئامۆژگارییەکانی سکیپەری هاتەوەوە یادو کە پێی وتبوو: بەشێوازێک بفڕە کە هەمیشە خۆر لەلای ڕاستەوەبێت. دەستی هیچ سوتەمەنی پێنەمابوو کاتێک «جێست» لە هێزی دەریایی دۆزیەوە، «جێست» دەستی بردە بۆسەر ئەو کەشتی فڕۆکە هەڵگرەی کە پێشتر سکیپەر کاری لەسەر کردبوو، دواتر (دەستی) زانی کە سکیپەر کاری ڕابەری لەسەر کەشتیەکە نەکردووە، بەڵک و تەنها یەک جار لەسەر کەشتیەکە هەڵفڕیوە، بۆیە (دەستی) بەمە زۆر نیگەران و نا ئومێد بوو، بۆیە دەبوایە ر زۆر بە زیرەکانە مامەڵەی بکردایە، (دەستی) بە ئالیارێکی نوێ و تەنکیەیکی پڕ لە سوتەمەنییەوە، بەرەو مەکسیک هەڵفڕی. (دەستی) توشی گەردەلولێکی زۆر مەترسیدار هات، لەڕێگای ئامێری



بێتەلی ڕادیۆیەکەیەوە ئاگاداری کردنەوە لەوەی کە خەریکە نوقم دەبێت، بەڵام خۆشبەختانە تیمێکی فریاکەوتن بەهانایەوە هاتن و ڕزگاریان کرد پێش ئەوەی نوقم ببێت، (دەستی) بە خراپی ئازاری پێگەیشتبوو، بەڵام لەکۆتایدا (دەستی) گەیشتە مەکسیک، بە سکیپەری ووت: کە هەموو شتێکی زانیوە لەسەر کەشتی فڕۆکە هەڵگرەکە، بۆیە سکیپەر دانی بەوەدا نا کە تەنها یەکجار فڕیوە لەسەر ئەو کەشتییە، ووتی: من ڕابەری ئەو کەشتییەبووم لە شەڕێکی قورسدا بەڵام هەموو فڕۆکەکان لەناو چوون تەنها من ڕزگارم بوو بۆیە جارێکی تر هەرگیز نەفڕیمەوە لەسەر ئەوکەشتییە. (دەستی) زۆر بە نا ئومێدانەوە ڕوو وەرگێڕا لەبەر ئەوەی سکیپەر درۆی لەگەڵ کردبوو، دەستی وەک پێشبڕکێ کارێک هەستی بەوە دەکرد کە چیتر چاک نابێتەوە، دۆنتی فیتەر هیچ پارچەیەکی شک نەدەبرد کە (دەستی) پێ چاک بکاتەوە، بەڵام فڕۆکەکانی تر دەستخۆشیان لێکرد و دڵخۆشی دەستیان دایەوە. ئیل چوو بە (دەستی) ووت: کە ناتوانێت بەبێ ئەو لە پێشبڕکێکەدا بەردەوام بێت، ئیلشانی کە خەڵکی ووڵاتی هند بوو پەروانەیەکی بە (دەستی) دا، بە دەستی ووت: لەوانەیە هەندێک بەختت بۆ بهێنێت. یەک لەدوای یەک هاوڕێکانی (دەستی) هاوکاریان کرد و هەموو ئەو پارچانەیان پێدا کە پێویستی بوو، دۆتی ووتی: ئەمە زۆر باشە بەم کارانە (دەستی) دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ پێشبڕکێکە. فڕۆکەکان دەستیان کردەوە بە فڕین بۆ شاری نیۆرک بۆ کۆتا بەشی پێشبڕکێکە، ڕیسپلینگەر فەرمانی بە تیمەکەی کرد ئاگاداری (دەستی) بن و چاودێری بکەن لە گەڵ ئەوانی تردا. هەرکە هێرشبەرەکان هێرشیان کردە سەر (دەستی) سکیپەر خۆی سوڕاندەوەو ئازایانە ڕووبەڕویان بویەوە. (دەستی)




به سکیپەری ووت: ئەوە تۆ دووبارە فڕیتەوە؟ بەڕاستی زۆر سپاست دەکەم. سکیپەر وەڵامی دایەوەو وتی: ئێستا بەردەوام بە لە فڕین بەپەڕی خێری و زیرەکانە، ڕیسپلینگەر لە پێشەوە بوو، (دەستی) زانی کاتی خۆی هاتووە لوتی بۆ ئاسمان بەرزکردەوە، ئەو ئازایەتییە لا دروست بوو کە لەبەرزییەکی زۆرەوە بفڕێت، کاتێک (دەستی) لەسامانەوە بەرو خوارەوە هاتەوە ڕێک لای کلکی ڕیسپلینگەرەوە بوو، کاتێک ڕیسپلینگەر نزیکبویەوە لەبردنەوە بە لەخۆبایانەوە بە فۆتۆگرافەرێکی ووت جوانترین وێنەم بگرە، ئەمە بووە هۆی ئەوە کە (دەستی) ببێت بەیەکەم و پێشبڕکێکە بباتەوە، دەستی یەکەم فڕۆکەی کشتوکاڵی بوو کە نازناوێکی وا گەورە بباتەوە، بەڵام هاوکاری هاوڕێکانی و هەوڵ و ماندوبونەکانی خۆی وایان کرد کە سەربکەوێت، ئێوەش ئەی منداڵە خۆشەویستەکان گەر دەتانەوێت سەرکەوتوبن گوێ بۆ ئامۆژگاری لە خۆتان گەورەتر بگرن و هەوڵ و ماندوبونی خۆتان هەمیشە سەرکەوتوتان دەکات، وە ئەگەر ئەتانەوێت نەدۆڕێن ئەوا هەرگیز وەک ڕیسپلینگەر لە خۆبایی و پلان گێڕی خراپ مەبن هەتا سەرکەوتوبونتان مسۆگەر بێت.

# میکی ماوس و فاصولیا سحراویەکە

دوور دوور شوێنێک هەبوو پڕ بوو لە داری سەوز و ئاسمانێکی شینی زۆر پاک و جوانی هەبوو، ئەو شوێنە ناوی دۆڵی خۆش بەختی بوو لە دۆڵی خۆش بەختی کانیەکان ئاوی سازگاریان لێدەهاتەدەر، بولبولەکان بە خۆشیەوە دەیانخوێند ئەو خەڵکەی لەوێ دەژیان هەمیشە دڵخۆش و کامەران بوون، هەموو رۆژێک بە خۆشی تێدەپەڕی، لەسەر بەرزایی گردێک کەبەسەر دۆڵی خۆش بەختی یدا دەیڕوانی قەڵایەکی زۆر سەرنج ڕاکێش هەبوو، لەناو قەڵاکەدا قیسارەیەکی ئاڵتونی هەبوو کە هەمیشە ئاوازی خۆشی لێدەدا و سحری خۆشی بەسەر دۆڵی خۆش بەختی دا بڵاو دەکردەوە. رۆژێکیان شتێکی ناخۆش روویدا کەسێک قیسارە ئاڵتونیەکی دزی و سحری خۆش بەختی لە دۆڵەکەدا نەما، هەر بۆیە بولبولەکان لە خوێندنی ئاوازی جوان وەستان، ئاوی کانیەکان وشکی کرد، بەروبومەکان لە گەشە کردن وەستان، مانگاکان چیتر شیریان نەما هەموو خەڵکی دۆڵی خۆش بەختی بێ تاقەت و برسی مانەوە. پێویستە شتێک بکەین، دۆناڵد ی جوتیار





واى ووت، لەو لاوە گوفى جوتياريش ووتى: ئەگەر شتێك نەكەين توشى قات و قڕى دەبيت و لە برسا دەمرين، ميكى كە مانگايەكى هەبوو ووتى: من مانگاكەم دەفرۆشم تا تۆزێ خواردنى پێبكڕم، ميكى مانگاكەى برد بۆ شارۆچكەكە و فرۆشتى، دواى ئەوەى ميكى مانگاكەى فرۆشت گەرايەوە بۆ لاى گوفى و دۆنالد و ووتى: من مانگاكەم فرۆشت بۆ كڕينى سێ دەنكە فاصولياى سەرسوڕهێنەر! تەنيا سێ دەنكە فاصوليا!! گوفى و دۆنالد هاواريان كرد، ئێمە چۆن بە سێ دەنكە فاصۆليا دەژين؟ بۆيە لە تورەيدا سێ دەنكە فاصولياكەيان فرێدايە سەر زەويەكە، گوفى و دۆنالد زۆر گرنگيان بە قسەكەى ميكى نەدا و بەجێيان هێشت چونكە زۆر برسى و ماندوبوون، بەلام...بەلام ئەو دەنكە فاصۆليايانە سحراوى بوون، ميكى بە نيگەرانيەوە ئەمەى ووت و ويستى دەنكى فاصۆلياكان لەسەر زەويەكە هەلبگرێتەوە بەلام دەنكە فاصۆلياكان چوونە ناو درزى زەويەكە. ئەو شەوە هەرسێكيان بە برسى خەويان لێكەوت، لە شەودا ئەو دەنكە فاصۆليايەى دۆنالد فرێى دا زۆر بە خێرايى چرۆى كرد و گەشەيان كرد بە شێوەيەك لقەكانى لە پەنچەرى مالەكەوە هاتە ژوورێ و مالەكەيانى لەگەل خۆيدا برد بەرەو ئاسمان كاتێك لە پەنجەرەى مالەكەيانەوە سەيرى دەرەوەيان كرد بينيان دۆلى خۆش بەختى يان بەجێهێشتووە و تەنها شت كە لە ئاسمانەوە دەيانبينى قەلايەكى زۆر سەرنج راكێش و گەورە بوو، ميكى ووتى: بابرۆين بۆ ئەو قەلايە و هەركەسێك لەو قەلايەدا بژێت پێوستە بەشە فاصۆلياى خۆى وەربگرێت، ميكى و دۆنالد و گوفى بە قادرمەى قەلاكەدا سەركەوتن و بە خۆشان لە دەرگاى پێشەوەى قەلاكە چوونە ژوورەوە، لە ناو قەلاكە مێزێكى گەورەى پڕ لە خواردن دانرا بوو سەر مێزەكە پڕ پڕ بوو لە خواردن و خواردنەوە، هەرسێكيان زۆر بە خێرايى بەسەر مێزەكەدا سەركەوتن، دواى ئەوەى



تێر و پڕ خواردیان و خواردیانەوە، لە ناکاو دەنگێکی زۆر نزمی هێواش بەر گوێیان کەوت. ئەوە کێیە؟ میکی لە هاورێکانی پرسی، دۆناڵد بەدەستی ئاماژەی بۆ سندۆقێک کرد کەلەسەر مێزەکە دانرا بوو و ووتی: ئەو دەنگە لەوێوە هات، هەرسێکیان لە سندوقەکە نزیک بونەوە و لە کونێکەوە سەیری نا سندوقەکەیان کرد و لێیان پرسی: تۆ کێی؟ من قیسارە ئاڵتونیەکەم دێوە زەبەلاحەکە منی هێناوە بۆ ئەم قەلایە تا ئاوازی بۆ بخوێنم، ئێستا زانیان کە قیسارە دزراوەکەی دۆڵی خۆش بەختیە، بەڵام هەر کە زانیان ئەو قەلایە هی دێوەکەیە ترسیان لێنشت، میکی زۆر ئازایانە ووتی: ئێرە بەجێناهێڵین تا قیسارە ئاڵتونیەکە لەگەڵ خۆمان نەبەینەوە بۆ دۆڵی خۆش بەختی، لەلای خۆشیەوە گوفی ووتی: تۆ ڕاست ئەکەیت پێویستە ڕزگاری بکەین و بیبەینەوە بۆ دۆڵی خۆش بەختی تا جارێکی تر خۆشی بۆ بگەڕێتەوە، دوای ماوەیەک گوێیان لە دەنگی پێی دێوەکە بوو بەرەو لایان دەهات ئەوەندە بەهێز بوو هەموو شتەکانی ژوورەکە دەلەرییەوە، قیسارە ئاڵتونیەکە ووتی پێویستە خۆتان بشارنەوە، هەرسێکیان زۆر بە خێرایی خۆیان لە دێوە زەلەکە شاردەوە، دێوەکە لەسەر مێزەکە دانیشت تاکو لەفەیەک بخوات بەڵام کاتێک ویستی قەپێکی گەورە لە لەفەکە بدات بینی لەفەکەی دەستی دەجوڵێتەوە، دێوەکە نەڕاندی و ووتی: مشکێک لەناو لەفەکەمدایە، میکی دوای لێبوردنی لێکرد کە نەیزانیوە لەفەی ئەوە بە بلوزی دێوەکەدا هەڵگەڕا و بە قاچیدا لەسەر دێوەکە دابەزیە خوارەوە و بە گوفی و دۆناڵدی ووت: ڕاکەن، دێوەکە زۆر تورە بوو هەرسێکیانی گەمارۆ دا تا لە سوچێکدا گیری کردن، دێوەکە داچەمیەوە تاکو بیانگرێت بەڵام هەرچۆنێک بێت میکی توانی خۆی رزگار بکات، دێوەکە گوفی و دۆناڵد ی گرت و خستیانیە ناو سندوقەکە و لەگەڵ قیسارە ئاڵتونیەکەدا





داینان و سندوقەکەی کلیل داو کلیلەکەی خستە گیرفانیەوە و دواتر لەسەر کورسیەک دانیشت تا سەرخەوێک بشکێنێت. میکی لە شوێنێکدا خۆی شاردەوە تا دێوەکە بە تەواوی خەوی لێکەوت، میکی چوە لای سندوقەکەو قیسارە ئاڵتونیەکە پێی ووت بچۆ کلیلەکەلە ناو گیرفانی دێوەکە دەربهێنە و رزگارمانکە، میکی زۆر بە خێرایی چوە سەر دێوەکە و بە هێواشی و لەسەر خۆ دەستی کرد بە گیرفانی دێوەکەدا و کلیلەکەی دەرهێنا، هەر کە کلیلکەی دەرهێنا دێوەکە جوڵایەوە بەڵام جارێکی تر خەوی لێکەوتەوە. میکی کلیلەکەی برد و سندوقەکەی کردەوە، دۆناڵد و گوفی قیسارە ئاڵتونیەکەیان لە سندوقەکە دەرهێنا و هەر چواریان زۆر بە هێمنی بەرەو دەرگای قەڵاکە ڕۆشتن، هەر ئەوەندەی لە دەرگاکەیان کردەووە دێوەکە چاوێکی کردەوە و زۆر بە توندی نەڕاندی، گوفی و دۆناڵد و قیسارە ئاڵتونیەکە رایانکرد میکی درکی بەوە کرد کە ڕەنگە دێوەکە بتوانێ بیانگرێت بۆیە بیری لەوە کردەوە شتێک بکات تاکو دێوەکە نەتوانێت بیانگرێت، بۆیە میکی گەڕایە و بە دێوەکەی ووت: نامگری، دێوەکە وازی لە گوفی و دۆناڵد و قیسارە ئاڵتونیەکە هێنا و بە دوای میکی کەوت بەڵام ئەوەندە خێرا نەبوو تا بتوانێ میکی بگرێتن میکی بەژێر فەرشەکەدا تا لا پەنجەرەکە رایکرد و هاواری کرد: ئەوەتا من لێرەم و لە چاو تروکانێکدا لە پەنجەرەکەو خۆی هەڵدایە خوارەوە، بۆیە دێوەکە گەرایەوە تاکو گوفی و دۆناڵد و قیسارە ئاڵتونیەکە بگرێت دەرگای قەڵاکەی کردەوە و چووە سەر یەکێک لە لقەکانی دار فاصۆلیاکە بەڵام گوفی و دۆناڵد بە مشارێک لقی فاصۆلیاکەیان بڕی و دێوەکە کەوتە خوارەوە بۆ نا و چەقی زەوی. گوفی و دۆناڵد و میکی قیسارە ئاڵتونیەکەیان جارێکی تر گەڕانەوە بۆ قەڵای دۆڵی خۆش بەختی و دەستی کردەوە بە ئاوازە خۆشەکانی و سحری خۆشی بەسەر دۆڵەکەیا بڵاوکردەوە، خۆشی سەر لە نوێ گەرایەوە بۆ دۆڵی خۆش بەختی لەسەر دەستی گوفی و دۆناڵد و میکی.



# بەسەرهاتی ماوگلی لەناو دارستاندا

دەگێڕنەوە لە کۆندا ژن و پیاوێک کە منداڵێکی بچوکیان پێبوو کاتێک لەدەریادا لەناو بەلەمێکی بچوکدا گەشتیان دەکرد لە نزیک دوورگەیەک کە دارستانێکی چڕی هەبوو زریانێکی قایم هەڵی کردوو بەلەمەکەی تێک شکاندن، ژن و پیاوەکەو منداڵەکەیان کەوتنە دەریاوە، کاتێک ژن و پیاوە چاویان کردەوە شەپۆلەکانی دەریا بەرو کەنارەکانی دورگەکەی بردوون، بەڵام منداڵە بچوکەکەیان دیار نەماوە، ژن و پیاوە کوڕە بچوکەکەیان زۆر خۆش دەویست بۆیە هەتا توانیان ناو دارستانەکەی بۆ گەڕان هەر نەیان بینیەوە، لەناو دارستانەکەدا دەنگی ئاژەڵە دڕندەکان دەهات وردە وردە کات درەنگی دەکردو دونیا تاریک دەبوو بۆیە ژنەو پیاوە بە نا ئومێدیەوە گەڕانەوە بۆ کەناری دەریاکە لەترسی ئەوەی ئاژەڵە دڕندەکان نەیان خۆن، کاتێک ژن و پیاوەکە گەیشتنەوە کەناری دەریاکە بینیان کە کەشتیەکی گەورە نزیکە لێیانەوە بۆیە هاواریان بۆ کەشتیەکە کرد، کەشتییەکە هات بە هانیانەوە هەڵی گرتن و بردنی، ژن و پیاوەکە زۆر نیگەرانی کوڕە بچوکەکەیان بوون وایان دەزانی کە کەوتۆتە دەریاوەو خنکاوە، بۆیە بڕیاریاندان بگەڕێنەوە بۆشارو ئەم ڕووداوە بۆ هەموو کەسوکاریان باس بکەنو پرسە بۆ کوڕەکەیان دابنێن چیدی بە ئومێدی زیندوو مانەوەی منداڵەکەیان نەمان و ئەو دوورگەیەیان بەجێ هێشت بۆ هەتا



هەتايە، بەڵام ژن و مێردەکە نەیان زانی کە منداڵەکەیان کەوتۆتە قەراخی دوورگەکەوەو گورکەکان بردویانەو بەخێویان کردووە، گورکەکان منداڵە بچوکەکەیان ناو نا ماوگلی و وەک منداڵی خۆیان بەخێویان کرد، ماوگلی لەکاتێکەوە کە منداڵێکی بچوک بوو، لەگەڵ گورگەکاندا ژیانی بەسەر دەبرد. ئەو هەر وەکو گورگەکان دەیلوراند و شەڕی دەکرد. ماوگلی لەگەڵ بەچکە گورگەکاندا یاری دەکرد و جارجاریش زۆرانی دەگرت. دارستان ببووە ماڵی ئەو. ماوگلی رۆژ بەڕۆژ گەورەتر دەبوو. گورگە بە تەمەنەکانیش کە وەکو باوک و دایک چاودێرییان دەکرد، نیگەرانی سەلامەتی ئەو بوون، ماوگلیش وای دەزانی ئەو گورگانە کەسوکاری ئەون، وەهەروەها دوانیشیانی بە باوک و دایکی خۆی دەزانی. لەناو دارستانەکەدا پڵنگێکی گەورەی بەهێز هەبوو ناوی شریخان بوو، پڵنگە گەورەکەی دارستان سوێندی خواردبوو کە رۆژێک ماوگلی بکوژێت. شریخان بەردەوام لە ئاگرێک کە مرۆڤەکان دایاندەگیرساند و لە تفەنگەکانیان ترسابوو. ئەو هەروا دەترسا کە ماوگلی کاتێک گەورە بوو، ببێتە راوچی، شیریخان ڕاو بکات. گورگەکان بیریان کردەوە باشترین رێگە بۆ ئەوەی ماوگلی لە مەترسی دوور بخەنەوە، ئەوەیە کە لە نزیک دێیەکدا لەناو مرۆڤەکاندا بژی، هەتا ماوگلی دوربێت لە مەترسی شیریخانی پڵنگ وەهەروەها بەڵک و ڕۆژێک ماوگلی گەورەببێت و بۆی دەربکەوێت کە مرۆڤەو مرۆڤەکانی ئەو گوندەش ببینێت و بچێت بۆ لایان. ماوگلی لەناو دارستانەکەدا چەندین هاوڕێی هەبوون لەوانە باڵەی ورچ و باگێرای پڵنگ بوون کە دوو هاوڕێی ماوگلی بوون زۆریان خۆش دەویست چەندین جار لەمەترسییەکانی



ناو دارستان دەیان پاراست. ڕۆژێک باگیرا پڵنگی دارستان هاتە شوێنی ژیانی گورگەکان. ئەو تەنها ئاژەڵێک بوو کە لەکاتی منداڵیدا، ماوگلی لە دارستانەکەدا دۆزیبووە. باگیرا ماوگلی سواری پشتی خۆی کرد و پێکەوە بە دارستاندا دەگەڕان. کاتێک شەو داهات، ماوگلی وەنەوزێکی دا وتی: من خەوم دێت، باشترە بگەڕێینەوە بۆ ماڵەوە. باگیرا وەڵامی دایەوە: ماوگلی، ئێستا ناتوانین بگەڕێینەوە، من تۆ دەبەمە گوندی مرۆڤەکان، چونکە شێرخان گەڕاوەتەوە ئەم بەشەی دارستان. باگیرا وای بیر دەکردەوە کە مانەوەی ماوگلی لەو شوێنەدا ترسناکە، بەڵام ماوگلی هەستی بە مەترسی نەدەکرد، زۆر حەزی لەژیانی ناو دارستان بوو ئەو هەمیشە حەزی لە یاری کردن و کاری سەرکێشی بوو لەگەڵ ئاژەڵەکانی ناو دارستان. ئەوان بۆ خەوتن چوونە سەر دارێک. هەر کە باگیرا خەوی لێکەوت، لەناکاو مارێکی گەورەی دارستان کە ناوی کا بوو، لەناو گەڵای دارەکانەوە بەرەو ماوگلی هات. ماوگلی بە مارەکەی وت: دوور کەوە..! کا زۆر برسی بوو، دەیویست ماوگلی بخوات. هەر لەبەر ئەوە چاوەکانی بڕیە ماوگلی و بەهێزی چاوەکانی خەواندی. پاشان کلکی بە دەوری جەستەی ماوگلی دا پێچا. لەو کاتەدا باگیرا چاوەکانی کردەوە و هاواری کرد. کا داچڵەکا، سەری بە توندی بەر دارێک کەوت و ماوگلی بەردا. ماوگلی لە حاڵەتی خزاندا بوو، کا هاتە خواری درەختەکەوە و خۆی بەدەوری جەستەیدا پێچا. ماوگلی لەو کارەی کای مار کە بەتوندی خۆی بە جەستەیەوە دەپێچا، پێکەنینی دەهات، بەڵام باگیرا نیگەران دەهاتە بەرچاو. ئەو نیگەرانی ماوگلی بوو، بە تووڕەییەوە وتی: بەم جۆرە دەتوانی ئاگات لەخۆت



بێ؟ کۆتایی شەو، ماوگلی لەلای باگیرا هەڵهات و بەخۆی وت: من دەتوانم ئاگام لەخۆم بێ. خۆشبەختانە ئەو ماوەیەکی زۆر بەدارستانی ترسناکدا نەگەڕا، چونکە لەگەڵ ورچێکی میهرەبان کە ناوی بالە بوو، ڕووبەڕوو بووەوە. ورچەکە وتی: کوڕەکەم، تۆ پێویستت بە یارمەتییە، من تۆ فێری شەڕ کردن بەشێوەی ورچەکان دەکەم. بەخێرایی ئەو دووانە بوونە خۆشەویستی یەکتر، بەجۆرێک وەکو دوو هاوڕێی زۆر کۆن، پێکەوە یارییان دەکرد، پێدەکەنین، ئەوان مۆزیان لێ دەکردەوە و پێکەوە دەیانخوارد. پشتی یەکتریان دەخوراند. پاشان لە حاڵێکدا کە بە پشتدا لەناو ئاوی ڕووبارەکەدا خەوتبوون، مەلەیان دەکرد و گۆرانی خۆشی و شادییان دەوت. پێکەوە چێژیان وەردەگرت. لەپڕ چەند دانە مەیمون لەسەر درەختەکانی ناو دارستانەوە هاتنە خوارەوە، ئەوان ماوگلیان بردە سەر دار و دەستاو دەستیان پێ کرد. ئەم دەیدا بەو، ئەو دەیدا بەم، لەو کاتەدا بالە هاواری کرد: هاوڕێ خۆشەویستەکەم بدەنەوە. مەیمونەکان یارییان بە دۆستە خۆشەویستەکەی ئەو دەکرد و پاشان دەستیان دەکرد بە میوە هاویشتن بەرەو بالە. بالە هاواری کرد: باگ.......ی.......را، داوای یارمەتی لەو کرد. بەڵام مەیمونەکان ماوگلی یان برد بەرەو ناو جەرگەی دارستان و هەڵهاتن. ئەوان ماوگلی یان بردە لای سەرۆکەکەیان «پاشا لۆیی». پاشا لۆیی ماوگلی لەسەر تەختەکەی خۆی کە لەناو وێرانەیەکی دارستانەکەدا بوو داینا. پاشا پەیمانی دا بە ماوگلی ئەگەر شێوازی داگیرساندنی ئاگریان فێر بکات،



ئامادەیە یارمەتی ماوگلی بدات تا لە دارستاندا بمێنێتەوە. پاشان پاشا مەیمونەکانی نیشانی ماوگلی دا، کە لەناو پەرستگایەکی کۆندا خەریکی ئاهەنگ گێڕان بوون. لەو ئاهەنگەدا کۆمەڵێک سەمایان دەکرد و کۆمەڵێکیش تەپڵیان لێ دەدا. لەو کاتەدا مەیمونێکی تازەی سەرسوڕهێنەر هاتە ناو ئاهەنگەکە. لەگەڵ پاشا لۆییدا دەستی بە سەما کرد. لەپڕ رووپۆشی رووخساری مەیمونەکە لاچوو، هەمووان تێگەیشتن ئەو جگە لە بالە کەسێکی تر نەبوو. پاشا لۆیی پەلی ماوگلی گرت و ڕفاندی. بالە و باگێرا شوێنیان کەوتن. بالە پاڵی دا بە پایەیەکەوە. کۆمەڵێک بەرد لە شوێنەکانی خۆیان نەمان و پەرستگاکە دەستی کرد بە ڕووخان. لەو کاتەدا ماوگلی خۆی هەڵدایە سەر پشتی باگێرا و لەگەڵ بالە لەو ناوە دوور کەوتنەوە. بەیانی رۆژی دواتر، بالە زۆر زوو ماوگلی لە خەو هەڵساند و پێکەوە بەرەو دارستان کەوتنە ڕێ. ماوگلی هەستی بە هەڵەکەی خۆی کردبوو، داوای لێبووردنی لە بالە کرد. دەستەکانی ئاڵاندە ملی بالە و لێی پرسی: بابە ورچە بۆچی توورەی؟ بالە لەگەڵ ئەوەی ماوگلی زۆر خۆش دەویست، دەیزانی کە ناتوانێ لە بەرامبەر شریخاندا چاودێری بکات. بۆ بەرگری لە هەڵمەتی شریخان، وا باشترە ئەو لەناو مرۆڤەکاندا بژی. بالە بە نیگەرانییەوە وەڵامی دایەوە: تۆ دەبێ لەناو مرۆڤەکاندا بژی. ماوگلی لەم قسەیە زۆر نیگەران بوو. وای هەست کرد کە بالە لەدەستی ئەو ماندوو بووە. دەستی کرد بە هەڵهاتن. ماوگلی لە حاڵێکدا رایدەکرد هاواری کرد: ئەی شوێنی



مرۆڤەکان هەرگیز تۆ وەکو باگێرای پیر نیت. من ئێوەم هەرگیز خۆش ناوێت. ئەو تا ئەو جێگەیەی توانی ڕایکرد. تا ئەو شوێنەی کە دەنگی بالەی پێ نەدەگەیشت. پاشان لەسەر تەختە بەردێک دانیشت و دەستی کرد بە گریان. لەدەنگی گریانی ئەو هەندێک لە داڵە گۆشتخۆرەکان ئاگادار بوون. بۆ ئەوەی کە ئەو دڵخۆش بکەن، هەموویان پێکەوە لەسەر دارەکان هەڵفڕین و یەکدەنگ هاواریان کرد: ڕاکە هاوڕێی خۆشەویست.. ڕاکە. لە دەرەوەی دارستان شریخان بەدوای ماوگلیدا دەگەڕا. کاتێک ماوگلی بینی هەوڵی دا هێرش بکاتە سەری، هەر لەو کاتەدا بالە کلکی شریخانی گرت و داڵەکانیش ماوگلیان بەرەو ئاسمان برد. شریخان بەدەوری خۆیدا دەسووڕایەوە. هەر چۆنێک بوو، توانی خۆی لەدەستی بالە رزگار بکات. هەر لەو کاتەدا هەورە بروسکەیەک هات و دای لە دارێک. دارەکە ئاگری گرت. ماوگلی لقێکی دارەکەی هەڵگرت و هەر بە ئاگرەکەوە بەستی لە کلکی شریخان، پڵنگی گەورە و بەهێز، لەکاتێکدا زۆر ترسابوو، هەڵهات. داڵەکان هانی ماوگلیان دا. ماوگلی بە خۆشحاڵییەوە بالەی لە ئامێز گرت. دەنگێکی سەیر سەرنجی هەموویانی ڕاکێشا. کاتێک ماوگلی بەرەو دەنگەکە ڕۆیشت، کچێکی بینی گۆرانی دەڵێت. ماوگلی تا ئەو کاتە مرۆڤی نەبینیبوو. سەرسام ببوو. کچەکە زەردەخەنەیەکی بۆ کرد و ماوگلی لەگەڵ ئەودا بەرەو لادێی مرۆڤەکان کەوتە ڕێ. ماوگلی کاتێک گوندی مرۆڤەکانی بینی، تێگەیشت کە بالە و باگێرا ڕاستیان دەوت. ئەو ماڵی ڕاستەقینەی خۆی دۆزیبۆوە، بەڵام دارستان و دۆستەکانی ناو دارستانیشی هەرگیز لەیاد نەکرد.